لێکۆڵینەوەی سیاسی

# پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسیی دەرەکی



دانا عەلی بەرزنجی

وەرگێڕانی
مامۆستا : یاسین زەنگەنە

چاپی یەکەم
١٤٢٥ - ٢٠٠٤

# پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسیی دەرەکی

دانا عەلی بەرزنجی

وەرگێڕانی

مافناس - یاسین زەنگەنە

چاپی یەکەم

١٤٢٥ ـ ٢٠٠٤

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان


- ناوی کتێب : پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی
- بابەت : توێژینەوە
- نوسەر : دانا عەلی بەرزنجی
- وەرگێڕانی لەعەرەبیەوە : مافناس ـ یاسین زەنگەنە
- چاپ : یەکەم
- ساڵی چاپ : ٢٠٠٤ز – ١٤٢٥ ك
- تیراژ : ٥٠٠دانە
- ژمارەی سپاردنی (١<<) ساڵی ٢٠٠٤ ی وەزارەتی ڕۆشنبیری دراوەتێ
- کۆمپیوتەر : کۆمپیوتەری نەمام
- چاپەمەنی سیما – سلێمانی شەقامی مەولەوی

# ناوەرۆك

## پێشکەشە بە ...

🕊بە دایکم و باوکم. وەك خۆشەویستی و وەفا...

🕊بەو کەسانەی لەسەر بنەمای دادوەری و بەرچاو ڕوونی بڕیاری سیاسی دەردەکەن. وەك دیاری و ئامۆژگاری...

# پێشەکی وەرگێڕ

زانستە ڕامیاریەکان وەك بەشێکی گرنگی بواری زانستە مرۆڤایەتیەکان سەنگ و بایەخی یەکجار زۆری هەیە، بە تایبەت لە دونیای ئەمڕۆدا.

پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی بە بەشێکی زیندوو و سەرەکی زانستە ڕامیاریەکان لە قەڵەم دەدرێت، چونکە بابەتێکی پەیوەستە بە واقیعی سیاسی دەوڵەت و یەکە نێو دەوڵەتیەکانەوە.

لەم سەرو بەندەدا لە کاتێکدا بابەتی لێکۆڵینەوەی (صنع القرار السياسي الخارجي) کەوتە بەردەستم، کە لەلایەن بەڕێز (دانا علی بەرزنجی)یەوە وەك لێکۆڵینەوەیەك بۆ بەدەست هێنانی بڕوانامەی (بەکالوریوس) لە زانستە ڕامیاریەکاندا ئامادە کرابوو، لە ساڵی (٢٠٠٢)دا.

لەبەر بەپێزی بابەتەکەو هەژاری کتێبخانەی کوردی لەم بوارەدا بە پێویستم زانی وەری بگێڕمە سەر زمانی شیرینی کوردی، شایەنی باسە ئەم بابەتە بە پلەی نایاب (امتیان) هەڵسەنگێنراوە ئەمەو سوپاسی کاك (دانا بەرزنجی) دەکەین کە هاوکاریو کارئاسانی بۆ کردین لە وەرگێڕانی بابەتەکەدا.

هیواداریـن بابەتەکە کەلێنێك لەبواری زانستە ڕامیاریەکان پڕ بکاتەوە و هاندەرێك بێت بۆ نوسەرو قەڵەم بە بڕشتەکان تا درێژە بەم کاروانە بدەن.

خوێنەری بەڕێز: گەر توانیبێتمان بە پوختی بابەتەکە وەرگێڕین و مافی خۆی بدەینێ ئەوا سوپاسی خوای دەوێت، گەر وانەبوو ئەوا دیاری شوان هەر هەڵەکۆکە.

وەرگێڕ
٢٠٠٣/٣/٨
سلێمانی

# پێشەکی

لێکۆڵینەوە لەسەر پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی* لە سایەی سیستمی سیاسی نێودەوڵەتی هاوچەرخ و پەیوەندیە نێودەوڵەتیە ئاڵۆزو فرە ڕەهەندەکاندا، وە لە سایەی نزیک بونەوەی شوێن و کات و خێرایی پەیوەندیەکاندا – کەوا لە یەکە سیاسیە نێودەوڵەتیەکان دەکات لە پەیوەندی‌یەکی بەردەوامدا بن – گرنگیەکی زۆری بەخۆیەوە بینیوە لە زانستی ڕامیاریدا، بە تایبەت لەم دواییانەدا.

لە ڕاستیدا پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی بۆتە جێگای باسی زۆرێک لە لێکۆڵەران و چەندین کۆنفرانس و سیمینار بەستراون بۆ شیکردنەوەو تاوو توێ کردنی، ئەمەش لە ڕوانگەی گرنگی بابەتەکەوەیە لە چوارچێوەی سیاسەتی دەرەکیدا.

هەندێک لە لێکۆڵەران پێیان وایە کە سیاسەتی دەرەکی لە زنجیرە بڕیارێکی یەک لەدوای یەک پێکدێت بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی هەڵوێست و بارودۆخە یەک لەدوای یەکەکان.

ناسین و تێگەیشتنی پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی لەهەر یەکەیەکی سیاسی نێودەوڵەتیدا یارمەتی‌دەرە بۆ ناسینی ئاڕاستە سیاسیەکانی ئەو یەکەیەو تێگەیشتن و شی‌کردنەوەی جموجۆڵ و هەڵسوکەوتی ئەو یەکەیە لە زنجیرە کارلێککەلی نێو سیستمی نێودەوڵەتی ئاسان دەکات، کە ئەو یەکەیە لەمیانەی ئەو ئاڕاستەو ڕەفتارانەوە هەوڵ دەدات بەرژەوەندی‌و ئامانجەکانی بەدی بهێنێت لەمیانەی پەیڕەوکردنی سیاسەتی دەرەوەیدا.

پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی بە یەکێک لە دژوارترین قۆناغەکان دەژمێررێت لە چوارچێوەی پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی‌و

---

* لێرەدا و لەکۆی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا کاتێک باس لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەکرێت وەک پرۆسەیەکی فرە لایەن و فرە قۆناغ و ئاڵۆز باسی لێوە دەکرێت، بەڵام کاتێک باس لە دەرکردنی بڕیاری سیاسی دەکەین ئەوا جیاوازەو تەنها بە یەکێک لە قۆناغەکانی پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دادەنرێت، واتە پرۆسەی دروستکردنی بڕیار پرۆسەیەکی فرە قۆناغ و فراوان و گشتگیرە و دەرکردنی بڕیاریش بە یەکێک لە قۆناغە سەرەکیەکانی ئەم پرۆسەیە دادەنرێت.

پارێزگاری بەرژەوەندیە نەتەوەیی‌یە باڵاکاندا. هەروەها چەندین دام و دەزگاو دەستەو دامەزراوە بەشێوەی ڕەسمی‌و ناڕەسمی‌و بەشێوازی جیاواز بەشداری لەم پرۆسەیەدا دەکەن و چەندین فاکتەری نێوخۆیی‌و دەرەکی دەوری ئەم پرۆسەیەیان داوە، ئەمە جگە لەو فاکتەرانەی کە پەیوەندیان بە باری دەرونی‌و کەسایەتی بڕیار بەدەستەوە هەیە.

لەم ڕوانگەیەوە ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵێکە بۆ درێژەدان بەو پێشکەوتنە زانستیەی کە لە بواری سیاسەتی دەرەکیدا هاتۆتە ئاراوە. لێکۆڵینەوەکەش لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی دەدوێت وەك بابەتێکی تیۆری ئەکادیمی، ئەمە جگە لە باسکردنی بڕیاری سیاسی وەك چەمك و ئاماژە کردن بە دیارترین قوتابخانەکانی هزری سیاسی لە کۆن و نوێدا.

لەم باسەدا وەك لێکۆڵینەوەیەکی زانستی بابەتیانە پشتمان بە سێ میتۆدی مێژوو، وەسفی و لێکدانەوە بەستووە.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵ دەدات وەڵامی چەند پرسیارێکی سەرەکی بداتەوە:-

- چۆن دەوڵەتان یان یەکە سیاسیە نێو دەوڵەتیەکان پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی ئەنجام دەدەن؟
- ئەو فاکتەرە سەرەکیانە کامانەن کە کار لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەکەن؟
- قۆناغەکانی پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی کامانەن؟
- ئایا بڕیار بەدەست چ ڕۆڵێك دەگێڕێت لەم پرۆسەیەدا؟

ئەم لێکۆڵینەوەیە بابەتیانە وەڵامی ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاری تر بە کورتی دەخاتە ڕوو، لەمیانەی چەسپاندنی ئەو فەرەزەیەدا کە دەڵێت:

((پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی، کە چەندین قۆناغ لەخۆ دەگرێت، کۆمەڵێك فاکتەری نێوخۆیی‌و دەرەکی کە لە ڕووی سەنگ‌و بڕی فشاریانەوە جیاوازن لە یەکدی - دەوریانداوەو کاریگەریی‌یان هەیە لەسەری، وەتا تێڕوانین‌و لێکدانەوەی بڕیار بەدەست بۆ هەڵسەنگاندنی گشت فاکتەرو پێشهاتەکان هۆشیارانەو بابەتیانەتر بێت‌و پشت بەزانیاری ڕاست‌و تەواو ببەستێت‌و دوور بێت لە هەوەس‌و ئارەزووی شەخسی‌و هەڵوێستی عاتیفی، ئەوا ڕێژەی سەرکەوتنی بڕیارەکان زیاد دەکات‌و بەپێچەوانەشەوە ڕاستە)).

ماوەتەوە بڵێم: دەخوازم لێکۆڵینەوەکە توانیبێتی ئامانجی خۆی بهێنێتە دی‌و هیچ هەوڵێکیش بێ کەم‌و کورتی نابێت.

# بەشی ڕێخۆشکەر

## بڕیاری سیاسی

وەك دەوترێت زانستی ڕامیاری زانستی دەوڵەت و دەسەڵات و هونەری فەرمانڕەوایی‌یە، هەر بۆیە لە سەرەتاوە بابەتی حوکم و دەسەڵات و سیستمی سیاسی جێگای بایەخ بووە، هەر لەم ڕوانگەیەوە بابەتی بڕیاری سیاسی یەکێك بووە لەو لایەنانەی بواری زانستە ڕامیاری‌یەکان کە هەر لە سەرەتاوە گرنگی زۆری پێدراوە.

سیاسەتیش – وەك دیڤید ئیستن دەڵێت – بریتی‌یە لەو بڕیارانەی کە لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە دەردەکرێت، زانستی سیاسیش بریتی‌یە لە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی ئەو بڕیارانە.[١]

لەم سۆنگەیەوە بایەخدانێکی نوێ بە بابەتی بڕیاری سیاسی گەڵاڵە بوو لە چەندین لایەن و بواری جیاجیادا، بە شێوەیەکی زانستی‌و کرداری، بە ئەندازەی گرنگی دانی زانستی رامیاری بە لێکۆڵینەوەی بابەتەکە، سیاسەتمەدارانیش گرنگیەکی زۆریان داوە بەم بابەتە، جا لەسەر ئاستی حکومی بێت یان ناحکومی.[٢]دروستکردنی بڕیاری سیاسی بە یەکێك لەو بابەتانە دەژمێردرێت کە جێی بایەخی لێکۆڵەرانی مێژوو و زانستە ڕامیاریەکانیشە.

بۆیە لێرەدا بە چاکمان زانی باس لە بڕیاری سیاسی بکەین وەك چەمك و هەڵوێستەیەکیش لەسەر بڕیاری سیاسی بکەین لە مێژووی هزری سیاسیدا بە شێوەیەکی کورت، تا تێڕوانینێکی گشتگیر مان لەسەر بابەتەکە لا گەڵاڵە بێت.

# باسی یەکەم

## چەمکی بڕیاری سیاسی

سەرەتا پێویستە چەمك و واتای بڕیاری سیاسی ڕوون بکەینەوە، بۆ ئەم مەبەستە چەندین ڕاو دیدو بۆچوون دەخەینە ڕوو، کە هەر یەکەو لە گۆشە نیگایەکەوە و بەپێی بوارو دیدی خۆی گوزارشتی لێ دەکات.

بڕیاری سیاسی وەك دەستەواژەیەك لە دوو ووشەی ((بڕیار)) Decisionو ((سیاسی)) Political پێك دێت. (بڕیار) لە سادەترین واتاکانیدا بریتی‌یە لە ((بنچینەی ڕەفتاری مرۆیی))[٣] یان بریتی‌یە لە چەسپاندنی ڕا لە حوکمی مەسەلەیەکدا[٤]. یان بە دەستەواژەیەکی وردو گشتگیر تر بڕیار ((کارێکی هەڵبژاردنە تاکێك یان ڕێکخراوێك یاخود دامەزراوەیەك پێی هەڵدەستێت، کە بە هەڵبژاردنی ئامانجێکی ئەو تۆ یان هەڵبژاردنی هۆکارو ئامرازی بەدیهێنانی ئامانجێکی ئەوتۆ لە کۆمەڵە جێگرەوەیەکی ئاشکرادا، سنورێك بۆ ڕاوێژکردن و ڕاڕایی دادەنێت، جێگرەوە ئاشکراکانیش کۆت و لەمپەری ناوخۆیی و چەندین کۆت و لەمپەر لەنێو ناوەندی دەرکردنی بڕیارەکاندا دەوریان داوە، هەندێك جاریش ئەو بنەماو ڕێوشوێنانە دەبێت لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاردا پەیڕەو بکرێت فاکتەرێکی گرنگ و کاریگەرن لە هەڵبژاردنی هەر بڕیارێکدا.[٥])) بەشێوەیەکی ڕوونتر دەتوانرێت بووترێت بڕیار بریتییە لە((دەرکردنی دوا هەڵوێست لە ڕێگەی یەکلا کردنەوەی مەسەلەیەکی ئەو تۆوە، بە سوور بوونی تەواو و دارشتنەوەی بەشێوەیەکی کرداری بەخستنە بواری جێبەجێ کردنەوە.[٦])) گەر بڕیار بەم شێوەیەی پێشوو پێناسە بکرێت، ئەوا ووشەی (سیاسی) Politicalوەك ئاوەڵناوێك بۆ ووشەی (بڕیار) دەگەڕێتەوە، واتە بڕیارەکان سیفەتی (سیاسی) وەردەگرن، بۆیە لێرەدا پێویستە واتای چەمکی (سیاسی) دەست نیشان بکەین کە بە سادەترین واتای ((بەڕێوەبردنی گەل و وولات دەگەیەنێت[٧])) یان

ووردتـر بڵێـین واتــه ((دابەشــكردنی دەســەڵاتدارانەی بــەهاكان لــه كۆمەڵگەدا))[8] وەك (دیڤید ئیستن) وتویەتی.

لەم دەروازەیەوە دەتوانرێت بوترێت بڕیاری سیاسی پێویستە لە لایەن دەستەیەكی دیاری كراوەوە دەربكرێت بە مەبەستی ڕێكخستنی كاروباری بەڕێوەبردنی وڵات و ڕێكخستنی پەیوەندییە ناوخۆییو دەرەكییەكان، هەروەها پێویستە بڕیاری سیاسی سیمای دەسەڵاتداریو گوێڕایەڵی بۆكردنی پێوە دیار بێت، واتە دەسەڵات توانای جێبەجێ كردنی هەبێت و لەلایەن گەلیشەوە گوێ ڕایەڵی بكرێت.

لەم بوارەدا چەندین پێناسە هەیە جەخت لەسەر پرۆسەی هەڵبژاردنی جێگرەوەكانی بڕیار دەكات بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجە خوازراوەكان. ئەمەش ناوەڕۆكی پێناسەكەی نیگرۆ Nigro گوزارشتی لێوەدەكات كە دەڵێت: ((بڕیار بریتییە لە هەڵبژاردنێكی هۆشیارانە بۆ ئەو جێگرەوانەی لەبەر دەستدان لە هەڵوێستێكی دیاری كراودا))[9].

یان بەشێوەیەكی وردتر بڵێین بڕیاری سیاسی ((هونەرێكی لۆجیكیو ئەخلاقییە، كە بەهۆی هەڵبژاردنی یەكێك لە چارەسەرەكان، دوای پرۆسەی پشكنینێكی ورد بۆ ئەو چارەسەرانەو ئاراستەو جێبەجێ كردنی بە شێوەیەكی ئەوتۆ كە باشترین هەل بۆ سەركەوتن فەراهەم بهێنێت))[10].

ئەو پێناسەیەی كە سنایدەر Snyder لەمەڕ پرۆسەی بڕیارداندا خستویەتیە ڕوو جەخت لەسەر ڕۆڵی بڕیار بەدەست دەكات لە پرۆسەی دەركردنی بڕیارداو دەڵێت: دەركردنی بڕیار ((ئەو پرۆسەیەیە كە لە ئەنجامی هەڵبژاردنی جێگرەوەیەك لەنێو كۆمەڵێك جێگرەوەی دیاریكراودا كە لە ڕووی كۆمەڵایەتیەوە ناسراون، جێبەجێدەكرێت بە مەبەستی گەیشتن بە حاڵەتێكی دیاری كراوی خوازراو لەلایەن بڕیار بەدەستانەوە)).[11]

لێرەدا ڕۆڵی بڕیار بەدەست وەك كارایەكی سەرەكیو فاكتەرێكی بنچینەیی دەردەكەوێت لە پرۆسەی دروستكردنی بڕیاری سیاسیدا، بەواتایەكی تر، دروستكردنی بڕیار ڕەنگدانەوەی تێگەیشتن و دیدو

بۆچوونی خاوەن بڕیارە بۆ هەلومەرجە ژینگەییەکان، ئەمەو تێگەیشتنو بیروبۆچوونو ئاراستەکانی بڕیاربەدەستیش لەژێر کاریگەری بەهاو بیرو باوەڕ.

بەڵام دکتور (ضرغام) بە درێژی پێناسەی بڕیاری سیاسی دەکات و دەڵێت: ((بڕیاری سیاسی هەڵوێستی دەوڵەتە لە ئاست ئەو کێشەو بارودۆخانەی دێنە پێش، وەك تەنگژەو قەیران، یان ئەو بابەتە گرنگانەی پەیوەندیان بە هەلومەرجی نێوخۆییو دەرەکیەوە هەیە وەك یەك، ئەمەش وا لە بڕیار بەدەستانی دەکات کە هەڵوێست و ئیلتیزامێکی مادیو مەعنەوی وەربگرن، بڕیاری سیاسیش لە هەموو قۆناغ و بارودۆخێکدا کە دەردەکرێت پێویستی بەوپەڕی وورد بینی و توانای پێشبینی کردنی ئەگەری کاردانەوە نێگەتیڤ و پۆزەتیڤەکان و توانای مامەڵەکردنی لە گەڵیاندا هەیە تا بتوانرێت بەچاکی جێبەجێ بکرێت)).[١٢]

لەم پێناسەیەوە دەتوانرێت گوزارشت لە بڕیار بکرێت بە ((ئەنجامدان یان ئەنجام نەدانی کارێك بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی کێشەیەکی دیاری کراو))[١٣] هەر بۆیە بڕیارەکان لە ڕووی سایکۆلۆجیو فەلسەفیەوە وەك ساتەوەختێك لە بەڕێوەبردن دیراسە دەکرێن.

بڕیار کۆتایی بە دڵەڕاوکێ دەهێنێت و پێش پرۆسەی جێبەجێ کردن و هەموو دەرەنجامەکانیش دەکەوێت.

بەم پێیە بڕیار وەك دەرکەوتەیەك لە دەرکەوتەکانی هێز دەکەوێتە بەرچاو، کۆتایی بە دڵەڕاوکێیو دۆشدامان دەهێنێت.[١٤]

بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی باسەکەمان ئاماژە بە پێناسەکەی دکتور (اسماعیل صبري مقلد) دەکەین کە دەڵێت: ((بە شێوەیەکی گشتی مەبەست لە دەرکردنی بڕیار گەیشتنە بە شێوازو جۆرێکی گونجاوی کارکردن لە نێوان چەند جێگرەوەیەکی کێبەرکێ کەردا. هەموو بڕیارێکیش مەبەست تێیدا بەدیهێنانی ئامانجگەلێکە یاخود بۆ دورخستنەوەی ئامانجگەلێکی نەخوازراوە))[١٥].

بە دەستەواژەیەکی وردو ڕونتر (بەڕای ئێمە) بڕیاری سیاسی ((بریتییە لە پرۆسەیەکی هەڵبژاردن لە نێوان چاکترین جێگرەوە گونجاوەکانی

بەردەست، پرۆسەیەکی ئامانجدارو کاریگەرە، هەڵقوڵاوی کارلێکی فاکتەرە بابەتی‌یە نێوخۆیی‌و دەرەکیەکان‌و ژینگەی دەرونی خاوەن بڕیارە، ئەمە بە ڕەچاوکردنی هۆکارو ئامرازەکان و تواناو دەرەنجامەکان)).
دەتوانین ئەم پێناسەیەی سەرەوەمان بەم شێوەیە ڕوون بکەینەوە:-
پێناسەکە جەخت دەخاتە سەر پرۆسەی هەڵبژاردن، واتە کاتێك بڕیار بەدەست دەیەوێت بڕیارێکی ئەوتۆ دەربکات، ئەوا پێویستە یەکێك لە شێوازەکانی خۆ دەرباز کردن لە باری دەرونی‌و دڵەڕاوکێ - کە مومارەسەی سیاسی دەیسەپێنێت - بگرێتە بەر، بەواتای دانانی سنورێك بۆ ئەو حاڵەتە نائاسایی‌یەی کە هەڵوێستەکە دەیسەپێنێت و پێویستە بڕیار بەدەست ڕووبەڕووی بێتەوە.
هەروەها پێناسەکە جەخت دەخاتە سەر ڕەهەندی ((ئامانج)) لە بڕیاری سیاسیدا، واتە بڕیاری سیاسی پێویستە ئامانجێك یان ئامانجگەلێکی دیاری کراوی لە پشتەوە بێت، چونکە دروستکردنی بڕیار لە سیاسەتی دەرەکیدا کۆمەڵێك هۆکارو ئامرازو مومارەسە دەگرێتەوە کە دەوڵەتێکی دیاری کراو لە ماوەیەکی دیاریکراودا دەیگرێتەبەر، بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجگەلێکی دیاری کراو.[١٦]
هەروەها پێناسەکە ڕەهەندی ((کاریگەری)) لە بڕیاری سیاسیدا لەخۆ دەگرێت، چونکە بڕیاری سیاسی مانایەکی نامێنێت گەر کاریگەری نەبێت لە سەر گۆڕەپانی سیاسی، جا ماددی بێت یان مەعنەوی. هەروەك چۆن پێناسەکە ئاماژە بە پرۆسەی کارلێکی نێوان فاکتەرگەلی ژینگەی نێوخۆیی‌و دەرەکی‌و ژینگەی دەرونی‌و کەسایەتی بڕیار بەدەست دەکات، وەك یەکێك لە ڕەگەزە سەرەکیەکانی پێناسەکە، چونکە هەریەکێك لەو فاکتەرانە کاریگەریەکی زۆری هەیە لەسەر پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی، جا ئەو کاریگەریانە ڕاستەوخۆ بن یان ناڕاستەوخۆ، درێژ خایەن بن یان مەودای کاریگەرێتییان کورت بێت. هەروەها بڕیار بەدەست پێویستە ڕەچاوی ئەو هۆکارو ئامرازانە بکات کە لەبەر دەستیدایە بۆ دەرکردن و جێبەجێ کردنی بڕیارەکە، کاتێك دەیەوێت بڕیارێك دەربکات. جا ئەو هۆکارو ئامرازانە ماددی بن یان مەعنەوی. ئەمە سەبارەت بە

هۆكارەكـان، بـەڵام لەمـەڕ ((توانـاو لێـهاتوویی)) كـە لـە پێناسـەكەدا ئاماژەی پێكراوە، مەبەست پێی ئەوەیە كە پێوەری تواناو لێهاتوویی بریتی‌یـە لـە ئاسـتی سـەركەوتن لـە بەدیـهێنانی ئامانجـە سیاسـیە خوازراوەكاندا كە لە پشت هەر بڕیارێكی سیاسیەوەیە كە دەسـەڵات دەری دەكـات، واتـە تـا چـەندێك بڕیارەكـە ئامانجـەكانی دێنێتـە دیو مەبەسـتەكانی دەپێكێـت ؛ مەبەسـتیش لـە ڕەچـاوكردنی ((دەرەنجامـەكان)) ئەوەیـە كـە خـاوەن بڕیـار پێویسـتە پرۆسـەی هەڵسـەنگاندنی دەرەنجامـەكانی بڕیارەكە لە پێش دەركردن و لـەدوای دەركردنیشـدا بـە ئـەنجام بگەیـەنێت، خـەملاندن و هەڵسـەنگاندنی ئەنجامـەكانیش لـە پێـش دەركردنـی بڕیـار كـارێكی پێویسـتە چونكـە هەموو بڕیارێك ئەنجامگەلێكی دیاری كراوی بە دوادا دێت كە پێویستە پێش وەخت حسابی بۆ بكرێت، لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بكەین كە بڕیاری سیاسی بۆ ئەوەی سەركەوتوو بێت پێویستە سێ مـەرجی تێدا بەدی بكرێت كە بریتین لە:-

١- ڕەوایەتی ٢- گەردن گیری ٣- گشتگیری.

ڕەوایەتی بەمانای دەرچوونـی بڕیارەكـە لـە دەسـەڵاتێكی یاسـایی یاسـپێردراوی قبـوڵ كـراوەوە، وە گـەردنگیری بـەو واتایـەی كـە لـە نێوەڕۆكی بڕیارەكە هێزێكی سەپێنەری لە پشتەوە بێت بۆ جێبەجێ كـردن و گوێڕایـەڵی كردنـی. وەگشـتی بێـت بـەو واتایـەی بڕیارەكـە كاروبارە گشتی‌یەكان و پێویستیەكانی كۆمەڵگە لەخۆ بگرێت.[١٧]

لـە ژێـر ڕۆشـنایی هـەموو ئـەم پێناسـەو ڕونكردنەوانـەدا بۆمـان دەردەكەوێت كە پرۆسەی دروستكردنی بڕیاری سیاسی پرۆسـەیەكی قـورس و ئـاڵۆزەو كـارێكی ئاسـان و سـادەنیە، چونكـە ئـەم پرۆسـەیە چەندین هۆكارو فاكتەرو ئامرازو ئامانجی جیاواز دەوری داوە، كە هـەر یـەكێكیان لـە لایـەن و گۆشـەیەكەوە كاریگـەری خۆیـان دەنوێنـن وپێویستە بە هەندیش وەربگیرێن لەكاتی بڕیارداندا، ئەمەو بڕیاردان بە هونـەر دەژمێرێت زیـاتر لـەوەی زانسـت بێـت، یـان ورد تـر بڵێـین: ((هونەرێكە لەسەر بنەمای زانست دامەزراوە)) .[١٨]

# باســـى دووەم

## بڕیاری سیاسی لە مێژووی هزری سیاسیدا

قسە کردن سەبارەت بە قۆناغەکانی گەشەکردنی هەر دیاردەیەك دوو ڕاستیمان دەخاتەوە یاد:

یەکەم:- ڕاستیەکی مێژوویی، واتە چەندین قۆناغی مێژوویی دیاریکراو هەیە کە تێپەڕیوە، پێویستە بیناسینەوەو شارەزای بین وەك بەشێك لە زانست.

دووەم:- ڕاستیەکی بابەتی، واتە ئەو گۆڕانکاریانەی ڕویانداوە سەبارەت بە بابەتی دیاردەکە لە ڕووی شیکردنەوەو پەیوەندیەکانیەوە، وا دەخوازێت بەدواداچوونی بۆ بکرێت بە مەبەستی کۆکردنەوەو تەواو کردنی زانیاری سەبارەت بە دیاردەکە.[١٩]

لەم ڕوانگەیەوە هەوڵدەدەین لەم باسەدا بایەخ بە ڕوونکردنەوەی بابەتی بڕیاری سیاسی بدەین لەمیانەی گرنگترین قوتابخانە فیکریە سیاسیەکانەوە هەر لە کۆنەوە، لە هزری یۆنانیو ڕۆمانی ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەروەها لەبیری ئیسلامی تا دەگاتە بیری ڕێنسانسی ئەورووپاو دەوڵەتی نوێ.

## یەکەم:- بڕیاری سیاسی لە هزری سیاسی یۆنانیدا

لەم قۆناغە مێژووییەدا چەندین پرسیاری فەلسەفی پێش وادە سەری هەڵدا سەبارەت بە چاکترین شێوازەکانی فەرمانڕەوایيو بارودۆخی سیاسيو ڕەوشت، ئەمەو جەنگی نێوخۆی نێوان ئەسیناو ئەسبرتە - کە بە شەڕی ((بلوبونزی)) ناسرا بوو - نیو سەدەی خایاند لە (٤٥٨ - ٤٠٤) پ.ز دا[٢٠] کاریگەریەکی زۆری هەبوو لەسەر ئاراستەی فیکری سیاسی یۆنانيو ئەو مەسەلانەی کەجێی بایەخی فکری سیاسی یۆنانی بوو لەمەڕ پرسیاری: چاکترین شێوازی حوکم و سیاسەت و شاری ناوازە ((المدنية الفاضلة))... ئایا ئەسبرتەی ئوروستوکراسیيە یان ئەسینای دیموکراسی؟..

ئەفلاطون لە کتێبە بەناو بانگەکەیدا (کۆماری) هێرشی کردۆتە سەر حوکمی دیموکراسی، لەبەر ئەوەی گەل ناتوانێت خۆی خۆی بەڕێوە ببات.[٢١] ئەمەو قسەی سەبارەت بە جۆرەکانی فەرمانڕەوایی کردووەو

ووتویەتی: هەندێك لەو دەسەڵاتانە فەرمانڕەوایی لە سنور دەرچوون‌و هەندێکیان دیموکراسین و هەندێکیشیان ئوروستوکراسین، ئەمەو وەزیفەو کاری حوکمرانیی وولاتی دیاری و پەیوەست کرد بەچینی فەرمانڕەوایانەوە Governmental class کە هەڵدەستن بە دانانی یاساو بنەما ڕێکخەرەکانی کۆمەڵگەو بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات‌و سەرکردایەتی کردنیان. ئەمەو لە دیدو بۆچوونی ئەفلاطون دا وەك دەردەکەوێت ((ناوەندی بڕیار بەدەستی فەرمانڕەوایانەوە دەبێت کە لە ئەنجومەنی (پیران) پێك هاتووە[٢٢])) کە چاك و لەبارن بۆ هەڵگرتنی باری قورسی فەرمانڕەوایی، بەتایبەت وەك یەکلاکەرەوەی دیاری کردنی هۆکارو ئامانجەکانی کۆمەڵگە. لەم گۆشە نیگایەوە ئەفلاطون وای بۆ چووە دەبێت فەرمانڕەوایی چڕ بکرێتەوەو کۆببێتەوە لەدەست زاناو فەیلەسوفەکاندا تا بڕیارەکانیان ڕاست و دروست‌و بەهێزو بەسود بێت بۆ کۆمەڵگە.

لەم میانەیەدا دەکرێت دوو تەوەرەی سەرەکی بخەینە ڕوو:-

١- لەمیانەی (هیرودوتس‌و توسیدید)ەوە کە گوتاری فەلسەفیان بۆ جۆری سیستەمەکانی سیاسەت (بەڕێوەبردن) جیاکردووەتەوە. کە یان سیستەمی چەسپاو ئارامن‌و تایبەتمەندییەکانی حوکمرانی بڕیار بەدەستانی تێدا دەردەکەوێت، نموونەش لەسەر ئەمە حاڵەتی (ئەسبەرطە)یە. وەیان نائارامە لە نێو جۆری سیستەمە سیاسیەکاندا لە دیموکراتیەوە بۆ ئوروستوکراتی ئیستیبدادی، ئەمەش وەك ئەسینا.

٢- بازنەی بڕیاری سیاسی فراوان دەبێت بە پێی فراوان بوونی پێکهاتەی فەرمانڕەوایی‌و ڕێژەی نوێنەرایەتی کردنی بۆ دەستە کۆمەڵایەتیەکان.[٢٣]

## دووەم:- بڕیاری سیاسی لە هزری سیاسی ڕۆمانیدا.

بیری ڕۆمانی بەهەواداری پرۆسەی کرداریی جیا دەکرێتەوەو دەناسرێتەوە، مێژووی ڕۆمانیش کەسانی لێهاتووی ئیداری زۆری بەخۆیەوە بینیوە، هەروەها خاوەنی سەرکردە گەلێکە کەشکۆداری ڕۆمایان دامەزراندوە، هەروەك چۆن مێژووی ڕۆمانیا بە فراوانخوازی دەرەکی جەنگی بەردەوام دەناسرێتەوە.

لە دەوڵەتی ڕۆمانیدا سیستمێکی ئیداریو سەربازیو ئەنجومی پیران هەبووە کە بە (ئەنجومی پیرانی گەل) ناسراوە، ئەمانە هاوشان لەگەڵ دەسەلاتی ڕەهای ئیمبراتۆردا. هەروەك چۆن مێژوو نووسی یۆنان (میترۆمین بولیب) لە سەدەی دووی پێش زاین و دوای ئەویش شیشرون (١٠٦-٤٣ پ.ز) لەو مێژوو نوس و فەیلەسوفانەن کە نوسینەکانیان ناوبانگی مەزنی هەیەو گرنگیان داوە بەنوسینی چیرۆكو شێوازەکانی ڕێکخستنی سیاسیو سەربازی کە ناوچەکانی ڕۆمانی لەمیانەیانەوە کاروبارەکانی خۆیان پێ ڕێکخستووە، هەروەك چۆن شیشرۆن وویستویەتی تیۆرێك دابنێت بۆ گەیشتن بە دەوڵەتێکی تەواو لەسەر بنچینەی دەستورێکی تێکەلاو، لەگەڵ بواردان بە بەرەو پێش چوونو گەشە سەندنی دەوڵەتی ڕۆمانی لە چوارچێوەی مێژووی دەستوری ڕۆماندا، ئەمەو لە دیدی شیشرۆندا ئەم جۆرە دەستورە لەو کاتەدا باشترین هۆکاربووە بۆ دروستکردنی سیستمێکی سیاسی کە ئارامیو کەماڵ بێنێتە دی.[٢٥]

ئەمەو تێبینی کراوە کە چۆن سیستمی ئۆلیگارشی لە فەرمانڕەوایەتیو ململانێ کردنیان لەگەڵ کاهینەکاندا بووەتە مایەی شەڕو ئاژاوەو هەرەسی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی. بەپێی ئەم گێڕانەوانە فەرمانڕەوایەتی ڕۆمانی لە هەرەمێکی سیوکراتی پێکهاتووە کە بە لوتکە دەست پێدەکات – کە لە کاهین و پاشادا خۆی دەبینێتەوە – دواتر دەستەی پیرانو دادوەرانو سەرکردە سەربازیەکان دێن.[٢٦] بەلام ڕۆڵی سەرەکی هەر بۆ ئیمپراتۆری دەگەڕێتەوە لە دەرکردنی بڕیارە چارەنووس سازو یەکلاکەرەوەکاندا، لە کاروباری بەڕێوەبردنی دەوڵەتیشدا دەستە گەلێك بەشداری بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی ئیمپراتور دەکەن، لەوانە/ ئەنجومەنی پیران، ئەنجومەنی گشتی، کاهینەکان، دادوەران و پیاوانی یاساو سەرکردەکانی سوپا.

هەتا چاخەکانی ناوەڕاست لە کۆمەڵگە ئەورووپیو ڕۆژهەلاتیەکاندا شێوەکانی فەرمانڕەوایەتی ڕەها باوبووە، کە پێك هاتبوو لە دوو دەسەلات (ئاینی، دنیایی)، ئەمە لە قۆناغی یەکەمی ئەم چاخەدا کە بە سەردەمی (ئۆگەستیس) ناسراوە.

بەلام لە قۆناغی دووەمدا کە هەردوو بیریار ((تۆما ئەکوینی و دانتی)) نمایندەی دەکەن، ڕۆڵی کلێسا لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا پەرەی سەند.

ئـەكوینی لـە بیرۆكـەی دامـەزراندنی دەوڵـەت دەدوا لەسـەر یاسـای سروشـتیو كۆمەڵایـەتیو بنـەمای بـەرژەوەندی گشـتی. بـەڵام لـە قۆنـاغی سێهەمدا سـەرەتاكانی جیاكردنـەوەی دەسـەڵاتی دینیو دەسـەڵاتی دونیـایی سەری هەڵدا، (پادۆ) كە بە نمایندەی ئەم قۆناغە دەناسرێت، بڕوای وایە كە ئامانجی دەوڵـەتی دونیـایی بریتییە لـە ڕوخـاندنی دەوڵـەتی كڵێسا.[٢٧] لـەم میانەیـەدا بۆمـان دەركـەوت كـە دەسـەڵاتی زەمـەنی تاكە دەسـەڵات بووە (لـەم قۆناغـەدا)، ئـەم قۆناغـە بـەوە جیادەكرێتـەوە كـە بانەگەشـە بـۆ دروسـتكردنی فەرمانڕەوایەتیـەك دەكـات كـە شـەرعیەتەكەی لـە بنـەما سروشـتیەكانەوە سـەرچاوە بگرێـتو چـەمكی سـەروەری وەك بنەمایـەك وەربگـیرێت، لـە چوارچێوەی بایەخدان بە هزری سیاسی ڕۆمانیدا.

لەژێر ڕۆشنایی ئەمانەدا دەردەكەوێت كە ناوەندەكانی بڕیاری سیاسـیو جڵەوی بەڕێوەبردنی كاروبارەكان لـەم چاخـەدا لـە نێـوان هاوسـەنگ بوونـی دەسـەڵاتی دینـیو دنیـاییو لاسـەنگ بونیـانو جیاكردنـەوەی هـەردوو دەسـەڵاتەكە لـە یـەكتری بـەپێی قۆنـاغـە مێژوویی‌یـە یـەك لـە دوای یـەكـەكان گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

## سێهەم:- میكـافیلیو بڕیاری سیاسی

بیری سیاسـی ئـەورووپی لـە كۆتـایی سـەدەكانی ناوەڕاسـتدا گۆڕانێكـی ڕیشـەییو قوڵـی بەخۆیـەوە بینـی، ئەمـەش بـە دەركـەوتنی بیریـاری ئیتـاڵی نیكـۆلا میكـافیلی (Niccola Machiavelli) (١٥٢٧ - ١٤٦٩ز) وە كتێبـە بەناوبانگەكـەی (مـیر) The prince، میكـافیلی لـەم كتێبـەیدا هـەوڵی داوە وێنەیـەكی ئاشـكرا ببەخشـێت بـەهێزو چۆنیـەتی بـەكارهێنانی هـێز لەلایـەن فەرمانڕەوایانـەوە، لەمیانـەی ووتـە بـە ناوبانگەكەیـەوە ((الغایـة تـبرر الوسیلة))[٢٨] بە واتای گرتنە بەری هەموو هۆكارێك - دروستو نادروست - بۆ گەیشتن بە مەبەستو ئامانج، ئەمەش تا ئێستا جێگەی گفت وگۆو مشتو مڕە. هـەروەها ئـەو هـەوڵی داوە بیرۆكـەی سـەربەخۆیی كاروبـاری سیاسـی دەوڵەت لە بیروباوەڕە ئاینیو پرنسیپە ئەخلاقیەكان بچەسپێنێت.

لەگەڵ ئەو دژە بۆچونیەی لە نێوان ڕاو بۆچوونەكانی میكافیلیدا لەمەڕ چاكـترین شـێوازەكانی فـەرمانڕەوایی، كـە لـە دوو كتێبەكـەیدا (مـیر)و (پێشنیارەكان) - المطارحات - بەدی دەكرێت، كە دەبینین لە كتێبی (میر)دا

بانگەشە بۆ دەسەڵاتی ڕەها دەکات و لەکتێبی (پێشنیارەکان) یشدا بانگەشە بۆ سیستمی گەلی ئازاد دەکات، پسپۆڕان لەم بوارەدا ڕاو بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەمەڕ شیکردنەوەی ئەم دژە بۆچوونەی میکاڤیلیدا، بەڵام زۆربەی ئەو ڕاو بۆچوونانە بۆ ئەوە دەچن کە دڵسۆزیو نیشتمان پەروەریو خۆش ویستنی میکاڤیلی بۆ وڵاتەکەی هانیداوە بۆ کارکردن لە پێناو یەکڕیزیو یەکێتی وڵاتەکەی لەژێر فەرمانڕەوایەتی سەرکردەیەکی بەهێزو بەتوانا، کە هەموو دەسەڵاتێکی ڕەهای لە دەستدا بێت تا بتوانێت سەروەری بۆ وڵاتەکەی – کە لەو کاتەدا پارچە پارچەو لاواز بوو – بگێڕێتەوە.

بۆیە دەبینین بانگەشە بۆ دەسەڵاتی ڕەها دەکات لە وڵاتەکەیدا (ئیتالیا)، بەڵام بانگەشەی دەسەڵاتی کۆماری بۆ وڵاتانی تری وەك سویسراو ئەڵمانیا دەکات.

(د. ثروت بدوی) پێی وایە ئەم بیروبۆچوونە نزیکترە لە ڕاستیەوە.[٢٩] میکاڤیلی لە (میر)دا جەخت لەسەر سەربەخۆیی بڕیاری دەوڵەت لە کاریگەرێتی دەرەکی دەکاتەوە، هەروەك چۆن دوو کۆڵەکەی بنچینەیی بۆ فەرمانڕەوایەتی دەست نیشان کردووە:-

١- پێویستی بوونی هێزو توانای یەکلایی کردنەوە (الحزم).
٢- سەربەخۆیی سیاسەت لە چوارچێوە ڕەوشتیو ئاینیەکان.[٣٠]

هەروەها هەر لە (میر)دا لە بابی نۆزدەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە میر پێویستە بڕیارەکانی جێبەجێ بکرێن و هەڵنەوەشێنرێنەوە، وە پێویستە بە بڕیارەکانیەوە پەیوەست بێتو بوار نەدات کەس فریوی بدات و بیخەڵەتێنێت.[٣١]

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا میکاڤیلی پێی وایە دواجار ئیلتیزامە ئەخلاقیەکان لە یاساو حوکمەوە سەرچاوە بگرن.[٣٢] ئەمە لەگەڵ جەخت کردنەوەی لەسەر پێویستی بوونی میرێکی بەهێزی بلیمەت بۆ دروست بوونی دەوڵەتێکی بەهێز کاتێك دەڵێت ((یەکێتی بێ بوونی میر نابێت))[٣٣]

لە دەرەنجامدا دەتوانرێت بوترێت میکاڤیلی بوونی کەسێکی بەهێزو توانای خاوەن بڕیارو یەکلاکەرەوە بە مەرجی سەرەکی دەزانێت بۆ بوونی دەوڵەتێکی بەهێز، ئەو پیاوە بەهێزەش کەسی سەرکردەیە. وە بڕوای وایە کە لابردنی کڵێساو دورخستنەوەی لە دەسەڵات کارێکی پێویست و حەتمیە،

هەروەها بە چاوی بایەخ و سەرسوڕمانەوە ڕوانیویەتیە فەرمانڕەوایی كۆماری ڕۆمانیو بڕواشی بە سیستمی فەرمانڕەوایەتی ئیستیبدادی هەبووە، بەڵام سیستمی دیموكراسی بە چاكترین سیستم زانیوە بە مەرجێك گەل چاوپۆشن و یەكگرتوو و ڕەوشت بەرزو یەك دەنگ بن و دەوڵەتیش هێمن و ئارام، بەڵام ئەگەر هاتوو دەوڵەت تازە پێگەیشتوو بێت یان نائارام و پەرتەوازە بێت ئەوا پێویستی بە فەرمانڕەوایەتی ڕەها هەیە.[٣٤] ماوەتەوە بڵێین میكاڤیلیش وەك هەر بیریارو فەیلەسوفێكی تر دەرهاویشتەی ئەو بارودۆخ و هەلومەرجە بووە كە تێیدا ژیاوەو گەشەی كردووە.

## چوارەم/ بڕیاری سیاسی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا

باسەكانی حوكم و دەسەلات لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزو فەرموودەدا ئاماژەی پێكراوە.

ئیسلام چەند بنەماو بنچینەیەكی گشتی دەست نیشان كردووە بۆ ڕێكخستنی پەیوەندی نێوان دەسەلات و فەرمانڕەوایان بە تاكەكان و گەلەوە لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامیدا.

لەم بوارەدا بنەمای ڕاوێژكردن (الشوری) بە گرنگترین بنچینە لە قەڵەم دەدرێت، هەروەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت (وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ)[٣٥] وە دەفەرمووێت (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ)[٣٦] هەروەها فەرموودەكانی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) جەخت لەسەر ئەم بنەمایە دەكەنەوە، لەبەر ئەوەی ڕێبازی ڕاوێژكردن بە گرنگترین بنەمای دەستوریو گرنگترین بنەمای حوكمی ئیسلامی لە قەڵەم دەدرێت.[٣٧]

ڕاوێژكردن بەپێی دەقەكانی قورئان بە (واجب) لە قەڵەم دەدرێت، چونكە فەرمانكردن لە قورئاندا بە (واجب) دانراوە، بەڵام جیاوازی ڕاو بۆچونەكان لەوەدایە كە ئایا پابەندبوون یان پابەند نەبوون بە ڕاوێژكردنەوە، واجبە یان نەء؟

ڕاو ئاڕاستەی زانایانی هاوچەرخ پێی وایە كە بوونی ڕاوێژكردن پێویستە (واجبە)، هەروەك چۆن پابەند بوون پێیەوە پێویستە، بە مەرجێك دژ بە دەقێكی ڕاشكاو نەبێت، وە هەموو ئەو ڕاوێژانەی كە لە پێغەمبەرەوە (صلى‌الله عليه وسلم) گێڕراونەتەوە لەم جۆرەن.[٣٨]

بەلام ڕای دووەم خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە ڕاوێژکردن پابەندکەر (ملزم)نیە بۆ ئەمیر لە دەوڵەتی ئیسلامیدا.

ئەوەی لێرەدا جێی گرنگی پێدان بێت ئەوەیە کە ئایا ئەنجومەنی ڕاوێژکردن و دەستەی ئەهلی حەلل و عەقد کاریگەرێتی‌یان هەیە لەسەر ئەو بڕیارانەی کە خەلیفە دەری دەکات؟

لەڕاستیدا سەرەڕای بوونی دەسەلاتی جێبەجێ‌کردن (وەزیرەکان) کە یاریدەدەری فەرمانڕەوای موسڵمانانن، پێویستە بۆ ڕا دەربڕین دوو ئەنجومەن هەبێت:-

١- ئەنجومەنی پسپۆڕان: کە هەڵبژاردەی زانایانی پسپۆڕ دەگرێتەوە.

٢- ئەنجومەنی پیاوماقوڵان: کە سەرکردەو نمایندەی چین و توێژەکانی دەوڵەتی ئیسلامی دەگرێتەوە.

وە لە کۆی ئەم دوو ئەنجومەنە ئەنجونی ڕاوێژی ئیسلامی پێك دێت.[٣٩]

لە ژێر ڕۆشنایی ئەمانەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە دەوڵەتی ئیسلامی ئەمیرێك سەرکردایەتی دەکات و جڵەوی کاروبارەکانی بەدەستەوە دەبێت، وە بەپێی بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام کار دەکات، کە لە قورئان و سوننەتی ڕاست و دروستەوە وەرگیراون، ئەمە لەو کاروبارانەدا کە جێگیرن و بەڵگەی یەکلاکەرەوەیان لەسەر هاتووە بە دەقی ڕاشکاو، بەلام لەو مەسەلانەدا کەجێی ئیجتیهادو ڕادەربڕین و جیاوازین، بڕیارەکان دوای ڕاوێژکردن بە کەسانی خاوەن ڕاو پسپۆڕو شارەزاو خاوەن تەقواو زانایان لە بوارە جیاجیاکاندا دەدەرێن.

ئەمەش جەخت لەسەر بەچاك زانینی (استحباب) ڕاوێژکردنی ئەمیر بە سوپاو شوێنکەوتووان و گەلەکەی دەکاتەوە، بۆ بەدەست هێنان و گەیشتن بە ڕایەکی دروست و گونجاو، بۆ سەرنج ڕاکێشان و ڕازی کردنی دەروونیان و خۆپاراستن لە گلەیی و گازندەیان، وە بۆ زانینی ئەو بەرژەوەندیانەی کە ئەوان دەیزانن، هەروەها جێبەجێ کردنی فەرمانی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت (وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ)[٤٠]

پێویستە دان بەوەدا بنێین کە قورئانی پیرۆز هەرچەندە تێڕوانینێکی دوورو درێژو دیاری کراوی بۆ شێوازی سیستمی حوکم لە دەوڵەتی

ئیسلامیدا دانەناوە*، بەڵام بنەما گشتیە جێگیرەکانو ڕێبازە سەرەیەکانی دەست – نیشان کردوە، وەك (دادپەروەری، ڕاوێژکردن، یەکسانی، میانڕەوی، برایەتی، هاوکاری کۆمەڵایەتی...هتد) کە بە گۆڕانی کات و شوێن گۆڕانیان بەسەردا نایەت.(٤١)

لە دەرەنجامدا بۆمان دەردەکەوێت کە بڕیاری سیاسی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا لە دواجاردا بەدەست خەلیفەیە، بەڵام دوای ڕاوێژکردن، وە پێویستە ڕاوێژەکەش سنوردارو لە چوارچێوەیەکی دیاری کراودا بێت لە ڕێبازو بنەما گشتیو جێگیرەکان، کە شەریعەت داینـاوە، لانەدات، وە ڕەچاوی بەرژەوەندی گشتیو هەلو مەرجو بارودۆخەکان بکات.

دواجار ئاماژە بەدیدو بۆچوونی (د. محمد عمارە) دەکەین لەم بوارەدا کە دەڵێت: ((لە کاروباری دەوڵەت دا ئیسلام شورای کردووە بە فەلسەفەیەك کە لەمیانەیەوە کاروباری خەڵکی بەڕێوە دەچێت، وە بڕیاردانیش بەروبوومی ڕاوێژکردنە، واتە بەشداری کردنی خەڵك لە پێگەیاندنی (ڕا) دا کەلە سۆنگەیەوە بڕیار دادەڕێژێت.(٤٢)))

## پێنجەم/ بڕیاری سیاسی لە چوارچێوەی دەوڵەتی نیشتیمانیدا

لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازیو ئەو پێشکەوتنە میکانیکی‌یەی کە ئەوروپا بەخۆیەوە بینی، وە لە دوای دەرکەوتنی سەردەمی ڕۆشنگەری، سەرەتای گەڵاڵە بوونی فەلسەفەیەکی سیاسی نوێ سەری هەڵدا، کە چەمکی دەوڵەت لەمیانەیەوە پێناسەو خوێندنەوەیەکی نوێ‌ی بۆ کرا..

بیری میکاڤیلی لە ڕووی سیاسی‌یەوە بە خاڵێکی گرنگی وەرچەرخان دادەنرێت لە هزری سیاسی ئەورووپیدا لە بواری سیاسەتو دەوڵەتدا.

* لە چەندین سەرچاوەی بەنرخدا باس لە مەسەلەی بڕیارەکان بە تێروتەسەلی کراوە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا وەك (الاحكام السلطانية) وە (نصيحة الملوك) وە (قوانين الوزارة وسياسة الملك) کە نوسراوی (ئیمام ماوەردی)ن کە لەسەردەمی دەوڵەتی عەباسیدا ژیاوە، وە کتێبی (السياسة الشرعية)ی شێخی ئیسلام (ابن تيمية) و کتێبی (الطرق الحكمية في السياسة الشرعية) کە نوسراوی ئیمام (ابن قيم ی جوزی)یە هەروەها کتێبی (المقدمة)ی ابن خلدون.

هــەروەها هــەردوو تیــۆری (پــەیمانی کۆمەڵایــەتی)و (جیاکردنــەوەی دەسـەڵاتەکان) هاتـە کایـەوەو بـوو بـە چوارچێوەیـەکی فەلسـەفی کـە دەوڵـەتی هاوچەرخی لەسەر دامەزرێت.[٤٢]

لـە سـەرەتاکانی سـەدەی سـیازدەی زایـنـدا دامـەزراوە ئینگلیزیـەکان پێشـکەوتنێکی بەرچاویان بەخۆوە بینی، ئەمـەش دوای ڕاگـەیاندنی بـەڵێن نامـەی ماگناکارتا (العهد الاكبر) بوو لـە سـاڵی (١٢١٥)زدا، ئـەم بەڵگەنامەیـە (٧٠) حـەفتا مـاددەی لـەخۆ گرتبـوو، هەرچـەندە بەڵگەنامەکـە نەدەگەیشـتە ئاسـتی یاسـا دانان، بـەڵام بـەکۆتێك دادەنرا لەسـەر دەسـەڵاتەکانی پاشـا لـە لایەك و لەلایەکی تریشەوە وەك سەرەتایەکی سیاسیو یاسایی هاتـە کایـەوە کە تەنها چارەسەری مافەکانی چینی پیاو ماقوڵانی نەدەکرد، بەڵکو هاوکاری بەدیهێنانو سەلماندنی مافو ئازادییەکانی تاکە کەسی دەکـرد بەگشـتی ئەمەش بە گەشەکردنێکی جۆری لە قەڵەم دەدرێت لە هزری سیاسیدا.[٤٤]

بـە بـڕوای بـۆدان (١٥٢٩-١٥٩٦)بوونـی دەوڵـەت پەیوەسـتە بـە بوونـی دەسـەڵاتێکی خـاوەن سـەروەرییەوە کـە لـە کەسـایەتی پادشـادا بەرجەسـتە دەبێت، هەربۆیە پادشا مافی ڕاگەیاندنی جەنگ و ئاشـتیو مومارەسـەکردنی فەرمانڕەوایـەتیو سەپاندنی بـاجو دیـاری کردنـی دادوەرانـی هەیـە.[٤٥] بـەم شێوەیە (بۆدان) کۆمەڵـە ئیمتیـازاتێکی ڕەهـای بـە پادشـا بەخشـی. بـەڵام لـە قۆناغەکانی دواتردا تیۆری (پـەیمانی کۆمەڵایـەتی) دەرکـەوت کـە هەریـەك لـە (تۆماس هۆبز و جۆن لۆك و جان جاك ڕۆسۆ) باسیان لێوە کردووە.

هــەروەها تیــۆری (جیاکردنــەوەی دەســەڵاتەکان) ســەری هــەڵدا، کــە (مونتسکیۆ) بەووردی باسی لێوە کردووەو تیۆرەکەش دەدرێتە پاڵ ئەو.

سەبارەت بـە تیـۆری یەکـەم (پـەیمانی کۆمەڵایـەتی)(تۆمـاس هۆبـز) کـە بـە دامەزرێنـەری ئـەم تیۆرییـە دادەنرێت، بڕوای وایـە کـە تاکـەکان سـازش لـە هـەموو مافـەکانیان دەکـەن بـۆ ئـەو کاربەدەسـتو خـاوەن دەسـەڵاتانەی کـە هـەڵیان بـژاردووە، وە دەسـەڵاتدار مـافی هەیـە بـەبێ هیـچ کـۆتو مـەرجێك هەڵسوکەوتیان پێوە بکات... کەواتە هۆبز بە یەکێك لە لایەنگرانی دەسەڵاتی ڕەها دادەنرێت، ئەم ئاڕاستەیەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە هۆبز یەکێك بووە لە سەرخەرانی ڕژێمی پادشایەتی بەریتانیو پشتگیری لە بەهێزکردنی

دەسەڵاتی پادشاکان کردووە.[٤٦] بۆیە پێی وابووە کە بڕیارە سیاسیەکان و یاساکان لە (پەیمانی کۆمەڵایەتیدا) تەنها یەك فەرمانڕەوا دەریان دەکات.

بەڵام (جۆن لۆك) دەڵێت: تاکەکان سازشیان لە هەموو مافەکانیان نەکردووە، بەڵکو لە هەندێکیان، هەربۆیە (لۆك) بە پشتیوانی دەسەڵاتی ڕەها ناژمێردرێت، بەڵکو بە پشتیوانی دەسەڵاتی سنوردار لە قەڵەم دەدرێت.

بەڵام (جان جاك ڕۆسۆ) (١٧١٢-١٧٧٨) بڕوای وایە کە دەسەڵاتدار خۆی لایەنێکی گرێ بەندەکە نییە، بەڵکو بە وەکیلی کۆمەڵ دادەنرێت کە مومارەسەی دەسەڵات دەکات لەبری ئەندامانی کۆمەڵ، وە گەل مافی لابردنی دەسەڵاتداریان هەیە هەرکاتێك ویستیان لەسەربوو.[٤٧] ئەمەو (ڕۆسۆ) بیرۆکەی دیموکراسی ڕاستەوخۆو بیرۆکەی زۆرینە (الأغلبیة) دەخاتە ڕوو، وە پشت بەستن بە سیستمی پەرلەمانی ڕەت دەکاتەوە، چونکە نوێنەران ناتوانن نوێنەری گەل بن و سەروەریش سازشی تێدا ناکرێت.

سەبارەت بە (یاساکان)یش دەڵێت: یاساکان ڕاست و دروست نین گەر لەلایەن ئیرادەیەکی گشتییەوە دەرنەچێت کە گوزارشت لە بەرژەوەندییە گشتییەکان بکات.[٤٨]

هەروەها ڕۆسۆ شێوازی حکومەتەکانی بۆ سێبەش پۆلێن کردووە:-

١- شێوازی دیموکراسی.
٢- شێوازی ئوروستوکراسی.
٣- حوکمی پادشایەتی.

ئەوەی شایەنی باسە ئەم دیدو بۆچوونانە کاریگەرێتییان لەسەر شۆڕشی ئەمەریکی (١٧٧٦)و شۆڕشی فەرەنسی (١٧٨٩) هەبووە بە تایبەت لەمەڕ بیرۆکەی (مافەکان)و (سەروەری)و (ئیرادەی گشتی)دا. ئەمە سەبارەت بە تیۆری (پەیمانی کۆمەڵایەتی).

تیۆری دووەم تیۆری (جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان)ە، کە دەدرێتە پاڵ (مونتسکیۆ) (١٦٨٩-١٧٥٥).

ئەو پێی وایە کە نابێت دەسەڵاتەکان لەیەك دەستدا کۆببێتەوە، بەڵکو پێویستە دابەش بکرێت لە نێوان دەستەی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریدا. ئەم بیرۆکەیە بە سەرچاوەیەکی مەعریفی و سیاسی دادەنرێت بۆ

شیکردنەوەیەکی دامەزراوەیی بۆ دەسەلآت و ناوەندەکانی دابەشکردنی دەسەلآت.[٤٩]

لەمیانەی ئەم باسەداو لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکاریو پێشکەوتنانەدا، بڕیاری سیاسی دوای ئەوەی لە دەستی خاوەن دەسەلآتی ڕەهادا لە سایەی حوکمی ڕۆمانی (ئیمپراتۆر)یان پادشایەتی ڕەهای ئەوروپا (لە سەدەکانی ناوەڕاستدا)بوو، گوێزرایەوە بۆ ئەو لایەنە سیاسییەی کە لە ئیرادەی گشتییەوە سەرچاوەی گرتووە، بەبێ لەبەرچاو گرتنی تایبەتمەندییەکانی ئەو دەستەو لایەنە دەسەلآتدارانە. دواتر گەل پابەند نابێت بە بڕیارەکانی دەوڵەتەوە گەر بڕیار بەدەستان شەرعیەتی خۆیان لەدەست بدەن. دواتریش گەل دەتوانێت لەمیانەی شۆڕش و خەبات کردنەوە ماف بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەن ماف.

هزری سیاسیو دەستوری نوێ چوارچێوەیەکی یاسایی بۆ دەوڵەت داناوە کە کارو بڕیارەکانی دەسەلآت کۆتوبەند دەکاتو چەند ئامرازو هۆکارێکی یاسایی دەبەخشێت بە هاولآتیان تا بەرەنگاری لادانو خوارو خێچی دەسەلآتداران ببنەوە، جا سەرچاوەی ئەو لادانە هەر شتێك بێت، وە بڕیارەکان ڕاست دەکەنەوە بەپێی بنەمای (دەوڵەتی یاسا).

بەم شێوەیە دەوڵەت بە هەموو دەزگاو دەستەو تاکەکانیەوە مل کەچی یاسا دەبێت، لەبەر ئەوەی ئەم مل کەچ بوونە گرێنتی تەواوی سەروەری ماف دەکات لەهەر کۆمەڵگەیەکدا.[٥٠]

# پەراوێزەکانی بەشی ڕێخۆشکەر

(١) فائزة حسين، مدخل إلى علم السياسة، محاضرات ألقيت على طلبة المرحلة الأولى في قسم العلوم السياسية بكلية القانون والسياسة، جامعة صلاح الدين، اربيل، سنة ١٩٩٨ –١٩٩٩.

(٢) منصف السليمي، صناعة القرار السياسي الأمريكي، مطبعة مركز الدراسات العربي – الأوروبي، الرباط، طبعة الأولى، ١٩٩٧، ص٥٣.

(٣) د. مازن إسماعيل الرمضاني، في عملية اتخاذ القرار السياسي الخارجي، مجلة العلوم القانونية والسياسية، كلية القانون والسياسة، بغداد، المجلد الثاني، ١٩٧٩، ص١٢٤.

(٤) المنجد في اللغة والإعلام، دار الشرق، بيروت، الطبعة الثامنة والعشرون، ١٩٨٦، ص٦١٦.

(٥) القاموس الحديث للتحليل السياسي، الدار العربية للموسوعات، بيروت، الطبعة الأولى ١٩٩٩، ص١١٩.

(٦) سعد خضر خلف العبيدي، دراسة تجريبية لبعض متغيرات اتخاذ القرار، جامعة بغداد، كلية آداب، علم النفس، رسالة ماجستير، سنة ١٩٨٧، ص٦٦.

(٧) محمد الحسيني الشيرازي، فقه السياسة، دار الأيمان، مطبعة رضائي، سقم، ١٩٨٣، ص٣٤.

(٨) زايد عبيد الله مصباح، السياسة الخارجية، منشورات ELGA ، مالطا، ١٩٩٤، ص١١.

(٩) د. السيد عليوة، صنع القرار السياسي في منظمات الإدارة العامة، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٨٧، ص١٥١.

(١٠) حسن حسين كاظم العامري، التجزئة العربية واثرها على القرار السياسي العربي، جامعة المستنصرية، معهد الدراسات القومية والاشتراكية، قسم إعداد مدرسي الثقافة القومية، رسالة ماجستير، ١٩٨٩، ص١٥.

(١١) د. مازن إسماعيل الرمضاني، السياسة الدولية بحث في منهاج اتخاذ القرار السياسي الخارجي، مجلة العلوم السياسية، العدد الأول، ١٩٧٩، ص٥٩.

(١٢) ضرغام عبدالله الدباغ، قضايا الأمن القومي والقرار السياسي، مطبعة الانتصار، بغداد، الطبعة الأولى، ١٩٨٦، ص٨٩.

(١٣) عادل السالوسي، إسرائيل والقرار السياسي في الشؤون الخارجية، مجلة السياسة الدولية، مؤسسة الأهرام، القاهرة، العدد ٥٧، يوليو ١٩٧٩، ص٩٣.

(١٤) موسوعة السياسة، الجزء الرابع، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ص٧٧١.

(١٥) د. إسماعيل صبري مقلد، العلاقات السياسية الدولية، مطبعة الكويت، الكويت الطبعة الثالثة، ١٩٨٤، ص٣٧٢.

(١٦) نجاة طه العبيدي، السياسة الخارجية الأمريكية في الخليج العربي ٧٣-١٩٨٠، الجامعة المستنصرية، المعهد القومي للدراسات القومية والاشتراكية، قسم الدراسات الدولية، رسالة ماجستير، ١٩٨٢، ص٦١.

(١٧) د. السيد عليوة، مصدر سبق ذكره، ص١و٣٨٠.

(١٨) جيمس منزيس بلاك، كيف تكون مديرا ناجحا، ترجمة: عبدالحليم ثابت، دار قباء، القاهرة، الطبعة الثانية،١٩٩٩، ص١٢٤.

(١٩) عبدالمعطي محمد عساف، مقدمة الى علم السياسة، دار مجد لاوى، عمان، الطبعة الثانية، ١٩٨٧، ص٧١-٧٢.

(٢٠) فائزة حسين، محاضرات في التأريخ السياسي القديم، القيت على طلبة المرحلة الأولى بقسم السياسة في كلية القانون والسياسة، جامعة صلاح الدين، سنة ١٩٩٨-١٩٩٩.

(٢١) د. غانم محمد صالح، الفكر السياسي القديم، جامعة بغداد، دار الحرية، بغداد، ١٩٨٠، ص٦٣.

(٢٢) منصف السليمي، مصدر سبق ذكره، ص٣٣.

(٢٣) نفس المصدر، ص٣٤.

(٢٤) د. محمد نصر مهنا، علم السياسة، جامعة أسيوط، القاهرة، ص١١٢-١١٣.

(٢٥) منصف السليمي، مصدر سبق ذكره، ص٣٥.

(٢٦) نفس المصدر والصفحة.

(٢٧) د. مهدي جابر مهدي، محاضرات في الفكر السياسي الوسيط، ألقاها على طلبة الصف الثالث بقسم السياسة، كلية القانون والسياسة، جامعة صلاح الدين، سنة ٢٠٠٠ – ٢٠٠١.

(٢٨) د. على عودة العقابي، العلاقات السياسية الدولية دراسة في الأصول والتأريخ والنظريات، دار الجماهيرية، بنغازي، الطبعة الأولى، ١٩٩٦، ص١٣٣.

(٢٩) د. مهدي جابر مهدي، الفكر السياسي الوسيط، مصدر سبق ذكره.

(٣٠) منصف السليمي، مصدر سبق ذكره، ص٣٧.

(٣١) د.كمال مظهر أحمد، ميكافيللي والميكافيلية، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٤، ص٣١.

(٣٢) جورج سباين، تطور الفكر السياسي، الكتاب الثالث، ترجمة، د. راشد البراوي، تقديم: أحمد سويلم العمري، بدون اسم المطبعة، ص٤٨٣.

(٣٣) عبدالجبار عبد مصطفى، الفكر السياسي الوسيط والحديث، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، الجمهورية العراقية، المطبعة الأولى، ١٩٨٢، ص٥٤.

(٣٤) نيقولو ميكافيلي، الأمير، فاروق سعد، تراث الفكر السياسي قبل الأمير وبعده، تعريب: خيري حماد، دار الآفاق الجديدة، بيروت، الطبعة الثامنة، ١٩٧٧، ص٢٤٩.

(٣٥) الآية القرآنية، سورة آل عمران، آية (١٥٩).

(٣٦) الآية القرآنية، سورة شوري، آية (٣٨).

(٣٧) د. محمد فاروق النبهان، نظام الحكم في الإسلام، جامعة الكويت الكويت، ١٩٨٧، ص١٩٩.

(٣٨) الموسوعة العربية العالمية، ج١٦، مؤسسة أعمال الموسوعة، رياض، الطبعة الثانية، ١٩٩٩، ص٤٢٠.

(٣٩) عبدالقادر عبدالعزيز، العمدة في إعداد العدة، بدون اسم المطبعة، ص١٢٦.

(٤٠) ابن قيم الجوزية، زاد المعاد، الجزء الثالث، مؤسسة الرسالة، بيروت، الثالثة، ١٩٩٨، ص٢٦٨.

(٤١) محمد نصر مهنا، مصدر سبق ذكره، ص١٨٥-١٥٦.

(٤٢) د. محمد عمارة، معركة المصطلحات بين الغرب والإسلام، دار نهضة مصر، ١٩٩٧، ص١٢٠.

(٤٣) منصف السليمي، مصدر سبق ذكره، ص٤٣.

(٤٤) د. خالد سعيد توفيق، محاضرات في حقوق الإنسان، ألقاها على طلبة الصف الثاني، بقسم العلوم السياسية، كلية القانون والسياسة، جامعة صلاح الدين، سنة ٢٠٠٠-٢٠٠١، ص٥٢.

(٤٥) د. مهدى جابر مهدي، محاضرات في الفكر السياسي الوسيط، مصدر سبق ذكره.

(٤٦) حميد الساعدي، مبادئ القانون الدستوري وتطور النظام السياسي في العراق، دار الحكمة، موصل، ١٩٩٠، ص٢٢.

(٤٧) نفس المصدر، ص٢٤.

(٤٨) د. مهدي جابر مهدي، محاضرات في الفكر السياسي الوسيط، مصدر سبق ذكره.

(٤٩) نفس المصدر والصفحة.

(٥٠) للمزيد راجع: د. محمد فاروق النبهان، مصدر سبق ذكره، ص٤٥.

# بەشی یەكەم

## كاریگەریتی فاكتەرە ناوخۆییەكان لەسەر پرۆسەی دروستكردنی بریاری سیاسی دەرەكی

ناسینی چۆنێتی دارشتنی سیاسەتی دەرەكی هەر دەوڵەتێك پێش هەموو شتێك پێویستی بە ناساندنی ئەو گۆرانكاریە نێوخۆیی و دەرەكیانە هەیە كەكار لە هەڵبژاردنی جێگرەوەكانی بەردەستی خاوەن بریار دەكات لەو دەوڵەتەدا.

فاكتەرەكان بە مانای بزاڤی هۆكارەكان و ئەوانەی دەبنە هۆكارو رۆڵ و كاریگەریتیان هەیە لەسەر هەڵوێست نواندن كە بە كارلێك كردنیان هەلومەرجەكان پێك دەهێنن، ئەم هەلومەرجانە سیفاتی ئەم فاكتەرانە وەردەگرن، بەپێی هێزو كاریگەریتی و بەشداری هەر فاكتەرێك لەو گۆرانكاریانەدا، ئەمەو بەشداری كردنی هەر فاكتەرێك لەو گۆرانكاریانەدا یان بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیكی وەلامی ئەو واقیعە دەداتەوە كە پەیوەستە بە هەڵوێستەكانەوە، یاخود بە شێوەی ویستراو و بە مەبەستەوە دەبێت، كە لە لایەن خاوەن هەڵوێستەكانەوە دەردەچێت، یان لە لایەن خاوەن بەرژەوەندیەكانەوە دەبێت.[1]

ئەمەش جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە ناتوانرێت تەماشای خاوەن بریارێك بكرێت دوور لەو هەل و مەرجانەی كە چواردەوریان داوە، جا ناوخۆیی بن یان نێودەوڵەتی، چونكە خاوەن بریار دەكەوێتە ژێر كاریگەریی هەلومەرجە سیاسی و ئابوری و كۆمەڵایەتیەكان و ویست و خواستەكانی گەل، لەبەر ئەوەی خاوەن بریار گوزارشت لە بەرژەوەندی چین وتوێژە جیاجیاكانی گەلەكەی دەكات بە شێوەیەكی گشتی لە بەرامبەر ژینگەی دەرەكیدا.[2]

لێرەوە دەتوانرێت بووترێت كە ئەم هەلومەرجانە هەندێك جار وا دەخوازن كە سیاسەتێكی دەرەكی دیاری كراو پەیرەو بكرێت، لەم روانگەیەوە ئەم بەشەمان تەرخان كردووە بۆ شیكردنەوەی ئەم بابەتە، كە لە سێ باسی جیاوازدا دەیخەینە روو بەم شێوەیەی خوارەوە:-

١- فاكتەرە مادی‌یەكان.

٢- فاكتەرە كۆمەڵایەتی‌یەكان.

٣- ئەو فاكتەرانەی پەیوەندیان بە سەركردەوە هەیە.

# باسی یەکەم

## فاکتەرە مادديەكان

### يەكەم :- فاكتەرە ئابوريەكان

فاكتــەری ئــابوری بــە گرنگــترین ئــەو فاكتەرانــە دەژمــێررێت كــە كاریگــەریتی‌یان لەســەر هــێزو توانــای دەوڵــەت و رەفتــاری خــاوەن بریــاری سیاسی دەرەكی هەیە. وە ئەم فاكتەرە چەندین رەگەزی تر لەخۆ دەگرێت، وەك سروشتی سیستمی ئابوری، بروجۆری مادده خامەكان، قەبارەی بەرهەم هێنانی نەتەوەیی، تێكرای بەكارهێنان و ئاستی پێشكەوتنی. ئابوری ئەم فاكتەرە رۆڵی گرنگ دەگێرێت لە بەخشینی سیفەتی تایبەتمەندێتی متمانە، جێگیری و ئارامی بە هەموو رەگەزە ناوخۆیی‌یەكانی تر، پێویستی یان پشت بەستن بە كەرەستەی بیانی كەم دەكاتەوە، هەروەك چۆن مرونەت و ئازادی موناوەرەو هەڵبژاردنی جێگرەوەكان لە بواری ناوخۆی و دەرەكیدا بە خاوەن بریــار دەبەخشــێت. وە توانــای وەســتان لەبــەردەم هــەموو فشــارەكان و بەرگەگرتنی هەلومەرجی نائاســایی زیــاد دەكــات، ئەمــەو فاكتــەری ئــابوری مەرجێكی سەرەكی و گرنگە بۆ خاوەن بریار تا بتوانێت رووبەرووی قەیرانە سیاسیەكان ببێتــەوە بــە تایبــەتی ئەوانــەی كــە مەترسیدارن وەك گــەمارۆو پچراندنی پەیوەندی تا دەگاتە ئەگەری پێكدادانی سەربازی.[٣]

نەبوونی بنچینەیەكی پتەوی ئابوری دەبێتە هۆی نەتوانینی دامەزراندنی دام و دەزگایەكی سەربازی پتەوو مۆدێرن بە تواناو داهاتی خۆماڵی، هەروەها ناتوانرێت پشتگیری پرۆســەی گەشە پێــدان و بوژاندنــەوە بكرێــت، هــەروەك چۆن نــاتوانرێت پێداویستی‌یە خۆراكیەكانی دانیشتوان تێر بكرێت. بــەبێ بوونــی ئابوری‌یــەكی بــەهێز تواناكــانی دەوڵــەت لاوازو كــەم دەبێــت بــۆ دابینكردنی ئاسایشی وڵات لە باری جەنگ و ئاشتیدا.[٤]

لێرەوە دەتوانین بڵێین باری ئابوری كاریگەرێتی‌یــەكی روون و ئاشكرای هەیە لەسەر توانای سەربازی و سیاسی و تەكنەلۆجی وڵات.

لە ڕاستیدا ئەو وڵاتانەی کە خاوەنی سیستمێکی ئابوری بەهێزو خاوەنی ڕێژەیەکی زۆری کەرەستەی سروشتین، یان خاوەنی ووزەو توانای بەرهەم هێنانن، بەتواناو بەهێزترن لە پشتگیری کردنی ئامانجە ستراتیجیە دەرەکیەکانیان و باری وڵات چەندین بازنەی فراوانی هەڵبژاردن و جێگرەکانی لەبەردەستدا دەبێت بۆ هەڵبژاردنی باشترین جێگرەوە بۆ ئەوەی بکرێتە بنچینەی بڕیارو دواتریش ببێتە بنەمای ڕەفتار لە سیاسەتی دەرەوەدا، بەڵام ئەو وڵاتانەی کە لە ڕووی ووزەو کەرەستەوە لە ئاستی پێویستدا نین زیاتر مەترسیان هەیە لەوەی تووشی لاوازی ببن لە بەرامبەر هەڵوێستە دەرەکیەکاندا و بواری هەڵبژاردنی جێگرەوەکان لەبەر دەمیاندا تەسک دەبێتەوەو بە ناچاری بڕیارێك دەدەن کە لەوانەیە گونجاو نەبێت لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیاندا.[٥]

لەمیانەی ئەم باسەدا بۆمان دەرکەوت کە ئەو وڵاتانەی لە بواری ئابوریدا بەهێزن دەتوانن دەرگای پاشکۆیەتی دابخەن، وە دەتوانن ڕۆڵی کاریگەر بگێڕن لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتیدا، هەروەها دەتوانن توانا ئابوریەکانیان بخەنە گەڕ وەك هۆکارێك بۆ خزمەتی سیاسەتی دەرەکیان، هەندێك جار دەوڵەت سیاسەتێکی دیاری کراو دەگرێتە بەر وەك سەپاندنی سزا ئابوریەکان یان سیاسەتی فریودان یان سیاسەتی دابڕین و پچڕاندنی مامەڵەی ئابوری.[٦]

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە جۆری توانای ئابوری بەردەست بە تەنها ناتوانێت ڕۆڵی گرنگ و کاریگەر ببینێت گەر توانا ئابوری‌یەکان بە شێوازێکی مۆدێرن و هاوچەرخانە نەخرێنە ڕوو و وەبەر نەهێنرێت لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجە نیشتمانی و نەتەوایەتی‌یەکان بەوپەڕی هێزو تواناو کاریگەرێتی‌یەوە.

ئەمەو چەندین مەرج هەیە کە کاریگەرێتی دروست دەکات لەسەر بڕیاری سیاسی، جا پێویستە بڕیار بەدەستان ئەو باوو مەرجانە لەبەر چاو بگرن، وەك قەبارەی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و پیشەسازی، بازرگانی ناوخۆیی و دەرەکی، بەدەست هێنانی دراوە گرانبەهاکان، برەو پێدانی توانای بیناسازی و ئاوەدان کردنەوە، وەك: بەندەرەکان، تۆڕی ڕێگاوبان، هێڵی

شـەمەندەفەر، بەرهەمــهێنانی ووزەی کارەبـا، تـۆڕی پەیوەندیــە سـلکیو لاسلکییەکان، هەروەها گەیشتن بە ئامادە باشیەکی ناوازەی جەماوەر.(٧)

ئەمەو دەوڵـەت یان ئەو یەکە نێودەوڵەتیانـەی کـەباری ئابوریـان لاوازەو پێویسـتە سـەرەکیەکانیان پڕناکاتــەوە بــە ناچـاری ڕوو دەکەنــە وولاتــە زلهێزەکـان تـا کۆمـەك و یارمـەتی مـەرجداریان پـێ بدرێـت بێگومـان ئـەم ڕەفتارەش وا دەکـات کـە بڕیـارو هەڵوێسـتەکانی لایـەنی لاواز سـەربەخۆیی لەدەست بدات.

## دووەم:- فاکتەرە سەربازیەکان

بێگومان فاکتـەری سـەربازی ڕۆڵـی کاریگـەری هەیـە لەسـەر هـەڵبژاردنی جێگرەوەکان (Alternatives) و دەرکردنی بڕیارو جێبەجێ کردنیشیدا.

لێرەدا مەبەسـت لـە فاکتـەری سـەربازی ئەو ڕەگەزانـە دەگرێتـەوە کـە لـە بـەردەم خـاوەن بڕیـاری سیاسـیدایەو دەتوانێـت بـەکاریان بـهێنێت، ئـەو ڕەگەزانـەش بـەپێی جـۆری قەیرانـە سیاسـیەکانو ئاسـتی ئـاڵۆزیو چـڕ بونەوەیان بەکار دەهێنرێت لە بەرامبەر شکستی چارەسەری سیاسیو هەوڵە دیبلۆماسـیەکان و دوور خسـتنەوەی توانـای سیاسـیو دیبلوماسـی بـۆ چارەسەری کێشەکان.

لەم ڕوانگەیەوە دەگەینە ئەوەی کە جەنگ تاکە ئەگەرو بژاردە نیە، بەڵکو دەکرێت جەنگ بخرێتە نێو هەڵبژاردەکانی ترەوە، وەك نمایش کردنی هێزی سەربازی، مانۆڕی سەربازی، هەڕەشەکردنی بەکارهێنانی هێزی سەربازی.

بەکارهێنانی هێزی چەکداری بۆ بەدیهێنانی ئامانجگەلێکە - کە جـەنگی سەرتاسەری نەگرێتەخۆ - بەڵکو بۆ سـەلماندنی ڕاستیەتی هەڕەشـەکانە، بۆ ڕاگـەیاندنی سـووربوون لەسـەر وازنـەهێنان لـە ئامانجـە سیاسـیەکان، وەك داگـیرکردنی خـاڵێکی سـنوریی سـتراتیژی، هـەروەها چوونــە نێــو جـەنگی سنوردار یان جەنگی سەرتاسەریو گشتگیرەوە.(٨)

لەمـەوە بۆمـان دەردەکـەوێت کە بـەکارهێنانی هـێزی سـەربازیلە هـەموو کاتێکدا پێویست نیە، بەڵام دەوڵەتان پشت بە توانا سەربازیەکانیان دەبەستن وەك هۆکارێکی مـاددی کاریگـەر لـە دەرکردنـی بڕیـاری سیاسـیدا لـە کـاتی ئاشتیو جەنگدا، لە کاتی ئاشتیدا هێزی سەربازی کاریگەرێتییەکەی لەسەر ڕەفتاری بڕیار بەدەست دەردەکـەوێت وەك فاکتـەرێك بـەکاری دەهێنێـت بـۆ

تۆقاندن‌و ترساندن‌و هەڕەشەی بەکار هێنانی بە مەبەستی فشار خستنە سەر ڕەفتاری سیاسی دەرەکی دەوڵەتانی تر، بە شێوەیەك کە ڕۆڵی ئیرادەیەکی ناڕاستەخۆ ببینێت لە پێناو سەرکەوتنی بڕیارەکەدا، لێرەدا کاریگەرێتی فاکتەری سەربازیمان بۆ دەردەکەوێت کە دەتوانێت ڕۆڵی هۆکارو مەبەست ببینێت لە هەمان کاتدا، لە کاتێکدا فاکتەری سەربازی ئامرازێکی کاریگەری‌و ڕۆڵی یەکلاکەرەوە دەبینێت لە هەڵبژاردنی جۆرێك لە جۆرەکانی ڕەفتار نواندن‌و جێبەجێ کردنی بڕیارەکان لە کاتی جەنگ یان ئاشتیدا.

لە هەمان کاتدا فاکتەری سەربازی ئامانج‌و مەبەستە، ئەمەش لەوەدا دەردەکەوێت کە کاتێك تەماشای توانا سەربازی‌یەکانی دەوڵەت دەکرێت وەك دیاردەو ڕوکەشی بنچینەیی هێزو توانای دەوڵەت‌و ئەو بنچینەیەی کە بڕیار بەدەست لە بڕیاردان دا پشتی پێدەبەستێت.[٩]

ئەمە لەکاتی ئاشتیدا، بەڵام لە حاڵەتی جەنگدا بەکار هێنانی هێزی سەربازی وەك گرنگترین ئامرازی ڕاستەوخۆی جێبەجێ کردنی بڕیارەکان دادەنرێت.

ڕۆڵی دام و دەزگای سەربازی* لە ڕژێمێکەوە بۆ ڕژێمێکی تر دەگۆڕێت، بۆ نموونە سیستەمی سەربازی ئەو ڕژێمانەی کە دام‌و دەزگا سەربازیەکان سەرچاوەی دەسەڵاتن تێیداو دەسەڵاتی خۆیان بەسەر سیستەمی دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایەتیدا دەسەپێنن. لەگەڵ ئەوەشدا دام و دەزگا سەربازیەکان بە تەنها بەم کارە هەڵناسن، بەڵکو سود وەردەگرن لە مەدەنیەکان‌و هاوبەشیان دەکەن لەم کارەدا، لە هەندێ کاتدا لەمیانەی مەدەنیەکانەوە حوکم دەکەن.[١٠]

لەم بوارەدا دەکرێت ئاماژە بە ڕۆڵی دام‌و دەزگا سەربازیەکان بدەین لە (ئیسرائیل)دا، دەزگای سەربازی تێیدا ڕۆڵی کاریگەرو بەرچاو دەبینێت لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی‌و سەربازیدا، بە تایبەت ئەو بڕیارانەی پەیوەندیان بە جەنگەوە هەیە بۆ نموونە جەنگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٧ ڕەنگدانەوەی هێزی دام‌و دەزگا سەربازی‌یەکان‌و ئاستی هەژموونی

---

* مەبەست لە دامەزراوەی سەربازی لێرەدا هەریەك لە سوپاو پۆلیس‌و هێزە نیمچە سەربازیەکان‌و دەزگاکانی ئاسایش دەگرێتەوە، واتە هەر دام‌و دەزگایەك کە هۆکاری هێزو ترس و تۆقاندنی لەبەر دەستدا بێت.

ئـەم دامو دەزگایانــە بـە ڕوونــی دەردەخــات لەســەر دەســەڵاتی سیاســی ئیسرائیلدا.

ئەمەو دەزگـای سـەربازی بـە شێوەیەکی کاریگـەرو بەرچاو بەشـداری لـە هـەموو قۆناغـەکانی دروسـتکردنی بڕیـاری (ئیسـرائیل)دا دەکـات، هـەر لــە ئامادەکردنی پــڕۆژەی بڕیارەوە تــا جێبـەجێ کردنــی.[11] و هەڵسـەنگاندنی دەرەنجـامی بڕیارەکــەش. ئەمــەش لــە لایــەن زانــای بــواری سیاســی (ئیسـرائیل)ی، پسپۆڕ لە پەیوەندیـە مەدەنیـە سـەربازیەکاندا (یـورام پـێری Yoram peri) جەختی لەسەر کراوەتـەوە. هـەروەها داڤیـد کـەمحی (David Kimchi) بەڕێوەبـەری گشـتی وەزارەتـی دەرەوەی (ئیسـرائیل) لـە سـاڵانی (١٩٨٠ –١٩٨٦) کە پێشتریش بۆ ماوەی (٢٧) سـاڵ لە وەزارەتـی بـەرگری ئیسـرائیلیدا کـاری کـردووە دەڵێـت: ((لــە کـاتی دروسـتبوونی دەوڵــەتی (ئیسرائیل)ەوە تا ئەمڕۆ دامو دەزگای سەربازی (ئیسرائیل)ی بە شێوەیەکی فـراوان دەسـتی وەرداوەتـە نێـو دروسـتکردنی بڕیارەکـانی دەوڵەتــەوە، وە دەڵێت: دامو دەزگای سەربازی ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە کاتێکدا وەزارەتی دەرەوە ڕۆڵی بەرچاوی نیە لە دروستکردنی بڕیارەکاندا)) نموونـەش لەسـەر ئــەم بـیرو بۆچوونــە ئەوەیــە کــە وەزارەتــی دەرەوەی (ئیســرائیل) ئاگــادار نەکراوەتەوە لە هێرشی ئیسرائیلی بۆ سەر بنکەی ئەتۆمی عێراقی لـە ساڵی ١٩٨١، هــەروەها وەزارەتـی دەرەوە ڕۆڵــی نــەبووە لــە نەخشــەو پلانڕێــژی داگیرکردنی لوبنان لە ساڵی ١٩٨٢.[12]

دەبێـت ئـەو ڕاسـتیە بزانـین کـە سـەرکردایەتی سیاسـی لـە دەوڵــەتی (ئیسـرائیل) پشـت بـە سـوپاو دەزگـای هـەواڵگری سـەربازی دەبەسـتێت بـە مەبەسـتی کۆکردنــەوەی زانیــاریو هەڵســەنگاندنو پێشـنیارەکان، ئەمــەش کاردەکاتە سەر جۆرو چۆنێتی تێگەیشتنی خـاوەن بڕیـار بۆ ژینگـەی دەورو بەری.

هــەروەها دەزگــای ســەربازی (ئیســرائیل)ی لــە ڕابـردوو و ئێستاشــدا سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ پێگەیاندنی نوخبەی سیاسـی دەسـەڵاتدار، ئەمـەو فـەرماندە سیاسـیەکان دەتوانـن کاریگـەرێتی‌یان هــەبێت بــۆ گرتنەبــەری سیاسەتێکی دیاری کراو لەمیانـەی کاریگـەرێتی‌یان لەسـەر ڕای گشـتی لـە ڕێگای لێدوانیانەوە بۆ کەناڵەکانی ڕاگـەیاندن. لێرەدا ئەوە دەهێنینەوە یاد

كه دام‌و ده‌زگای سه‌ربازی له توركیا هه‌ر له كوده‌تای مایسی (١٩٦٠)ه‌وه تا ئێستا ڕۆڵی سه‌ره‌كی ده‌بینێت له ژیانی سیاسی توركیادا، له‌میانه‌ی ئه‌و پێگانه‌وه كه له دام‌و ده‌زگا سیاسیه‌كانی ولاته‌كه‌یاندا به‌ده‌ستیان هێنانه‌وه، كه خۆی له پله‌ی سه‌رۆك كۆماردا ده‌بینێته‌وه كه به‌پێی نه‌ریتی توركیا له لایه‌ن سه‌ركرده سه‌ربازی‌یه‌كانه‌وه هه‌ڵده‌بژێرێت. هه‌روه‌ها ئه‌نجومه‌نی ئاسایشی نه‌ته‌وه‌یی سه‌رۆكی ئه‌ركانی گشتی‌و سه‌ركرده‌ی هێزه چه‌كداره‌كانیش تێیدا سه‌ر به ده‌زگای سه‌ربازین[١٣] له توركیادا. هه‌روه‌ها له توركیادا (كه مل كه‌چی هه‌ژموونی سه‌ربازیه‌كانه) له بواری كرداری‌یه‌وه بڕیاری گه‌ردنگیر (ملزم) بۆ حكومه‌ت ده‌رده‌كات، ئه‌گه‌ر حكومه‌تیش نه‌یاری یان دوو دڵی پیشان بدات له جێبه‌جێ كردنیدا ئه‌وا ڕووبه‌ڕووی زه‌نگی هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه ده‌بێت، هه‌روه‌ك چۆن حكومه‌ته‌كه‌ی (نه‌جمه‌ددین ئه‌ربه‌كان) یان دورخسته‌وه له ده‌سه‌لات به‌هۆی مله جیڕێ كردنیه‌وه له جێبه‌جێ كردنی بڕیارو داواكاریه‌كانی ئه‌نجومه‌ندا له‌مه‌ڕ پاراستنی عه‌لمانیه‌ت‌و له‌ناوبردنی ئوسوڵیه‌كان.

ئه‌نجومه‌نی ئاسایشی نه‌ته‌وه‌یی توركی، وه‌ك یه‌كێك له كه‌ناڵه‌كانی كاریگه‌ریێتی دام‌و ده‌زگای سه‌ربازی له پرۆسه‌ی بڕیارداندا، به‌ر پرسه له‌و سیاسه‌ته توندو تیژه‌ی كه حكومه‌ته توركیه یه‌ك له دوای یه‌كه‌كانی توركیا گرتویانه‌ته به‌ر به‌رامبه‌ر به كێشه‌ی كورد كه به سیاسه‌تی هۆلۆكۆست ناسراوه، به مانای ڕوخاندنی ژماره‌یه‌كی زۆری گونده‌كانی باشوری ڕۆژهه‌لاتی توركیا كه زۆربه‌یان كورد نشین بوون (كه به ١٣-١٥ ملیۆن كه‌س مه‌زه‌نده ده‌كرێت).[١٤]

به‌م شێوه‌یه بینیمان كه عه‌سكه‌رتاره‌كانی توركیا خاوه‌ن هێزێكی كاریگه‌رن له پرۆسه‌ی دروستكردنی بڕیارو سیاسه‌تی ده‌ره‌كیدا. ئه‌وه‌ی شایه‌نی وه‌بیر هێنانه‌وه‌یه فاكته‌ری سه‌ربازی هه‌موو ئه‌و ڕه‌گه‌زانه ده‌گرێته خۆ كه په‌یوه‌ندیان به باری سه‌ربازی‌یه‌وه هه‌یه، گرنگترین ئه‌و ڕه‌گه‌زانه: هێزه چه‌كداره‌كانه، ئه‌مه‌ش توانای جه‌نگین ده‌گرێته‌وه له ڕووی توانای مرۆیی یان ئاماده باشی‌و چه‌ك‌و ته‌قه‌مه‌نیه‌وه، هه‌روه‌ها پێشكه‌وتنی بواری به‌ره‌و پێشچوونی ته‌كنه‌لۆجی ده‌وڵه‌ت‌و ئاستی تواناكانی له به‌رهه‌م هێنان‌و پڕچه‌ك كردنی هێزه یه‌ده‌گیه‌كان‌و ئاستی تواناكان بۆ ئاماده باشی‌هێزه‌كان

به شێوەیەکی خێرای ڕەچاو کراو لە کاتی جەنگ‌و حاڵەتی قەیران‌و تەنگژەی لە ناکاودا. هەروەها ڕەهەندی چۆنێتی هێزە چەکداریەکان، ئەمەو ئاستی بەهرەو لێوەشاوەیی سەرکردە بەر پرسەکان لە پرۆسەی نەخشە کێشانی ستراتیجی دەگرێتەوە.[١٥]

هەموو ئەم ڕەگەزانە پێکەوە هێزی دەوڵەت پێك دەهێنن، ئەم هێزانەش لەمیانەی ڕۆڵ‌و کاریگەرێتی‌یان فاکتەرێکی هاندەرو پاڵپشتن بۆ بڕیار بە دەستان بۆ دەست نیشانکردنی ئامانجەکان‌و هەوڵدان بۆ جێبەجێ‌کردنیان، ئەمەش سەر دەکێشێت بۆ سەربەخۆیی سیاسەتی دەرەکی. بەلاّم ئەو وولاّتانەی لاوازن‌و توانای سەربازی پێویستیان نیە، زۆرکات ناچار دەبن سیاسەتی شل ڕەوی مل کەچی بگرنە بەر، وە داڕێژەرانی سیاسەتی دەرەکی لەو وولاّتانەدا بە شێوەیەکی سەرەکی بەدەم داواو مەرجەکانی ژینگەی دەرەکیەوە دەچن، واتە مەرج نیە بە شێوەی خوازراوی خۆیان‌و بە ئاڕاستەی ویستی سەربەخۆیی خۆیان مامەڵەو هەڵسوکەوت بکەن، بەڵکو زۆرجار دەکەونە ژێر کارتێکردن‌و سەپاندنی ویستی بەرامبەرەوە.

لە ڕۆشنایی ئەم باسەدا دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە توانای سەربازی ڕۆڵی گرنگ‌و کاریگەری هەیە لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکیدا، ئەمەش هاوشان لەگەڵ پەیوەست بوونی کەرەستە سروشتی‌یەکان و توانای ئابوری‌و تەکنەلۆجی‌و پیشەسازی وڵات‌و بوونی ورەو مەعنەویاتی ڕۆحی لای هێزە چەکدارەکان...

## سێهەم:- فاکتەرە جوگرافیەکان

فاکتەرە جوگرافیەکان کاریگەرێتی ڕوون‌و ئاشکرایان هەیە لەسەر پرۆسەی دروستکردنی سیاسەتی دەرەکی وولاّت، ئەمەش لەمیانەی ئەو پەیوەندی‌یەی کە خاوەن بڕیار بە ژینگەی جوگرافیەوە دەبەستێتەوە.

لە ڕابردوودا ئەم فاکتەرە بە فاکتەرێکی بنچینەیی لە قەڵەم دەدرا، بەوەی ئەم فاکتەرە ڕەفتاری خاوەن بڕیاری سیاسی دەست نیشان دەکات‌و لە ڕیزبەندیدا یەکەمایەتی پێ دەبەخشرا، بەلاّم ئەو پێشکەوتنە زانستی‌و تەکنیکیانەی کە لە بوارە جیاجیاکانی ژیاندا ڕوویدا، بووە مایەی کەمکردنەوەی گرنگی‌و بایەخی ئەم فاکتەرە.[١٦]

جیهانی هاوچەرخ پێشکەوتن و گەشەکردنێکی بێ سنوری لە زۆربەی بوارەکانی تەکنەلۆجی و پەیوەندی کردن و هاتوچۆو پیشەسازی و تەکنەلۆجیای سەربازی بەخۆوە بینیوە، بەلام لەگەڵ ئەم هەموو پێشکەوتانەدا دەبێت دان بە رۆڵی فاکتەری جوگرافیدا بنێین لە پرۆسەی بریاردانداا، هەر بۆیە جوگرافی ناسی بەناوبانگی ئەمریکی (سپایکمان) جەختی لەسەر ئەم فاکتەرە کردۆتەوەو ووتوویەتی: ((جوگرافیا فاکتەرێکی بنچینەیی یە بۆ سیاسەتی دەرەکی وولات، لەبەر ئەوەی رەگەزو هۆکارەکانی زیاتر بەردەوامن بە درێژایی رۆژگار، هەر بۆیە پێویستە پێگەی هەر وولاتێك بە وولاتانی ترەوە لە رووی جوگرافیەوە دیراسە بکەین تا لەمیانەیەوە بتوانین سیاسەتی دەرەکی ئەو وولاتە بناسینەوە))[١٧] ئەمەش بە مانای ئەوە دێت کە خاوەن بریارپێویستە لە کاتی بریارداندا پێگەی وولاتەکەی لە رووی جوگرافیەوە لەبەرچاو بگرێت.

گرنگی پێگەی جوگراف بەنیسبەت دەوڵەتانەوە لە چەند لایەنێکدا دەردەکەوێت کە پەیوەندی دوور یان نزیکیان بە سیاسەتی دەرەکی. ئابوری و سیاسی و سەربازی یەوە هەیە. ئەم گرنگیەش لەوەدا دەردەکەوێت کە پێگەی جوگرافی بایەخی خۆی هەیە لە ووشکانی و دەریاو ئاسماندا. هەرێمی ووشکانی قولایی یەکی بەرگری کردنی هەیە کە هاوکاری دەوڵەت دەکات کە هێزە سەربازیەکانی لە بواری بەرگری ووشکانیدا دامەزرێنێت و تۆکمەی بکات، ئەمەو هەرێمی شاخاویش یارمەتیدەرە بۆ دروستکردنی دانانی نەخشەی هێرش بردن لە سیاسەتی سەربازی - دەرەکیدا، بەلام هەرێمی شاخاوی لە بواری هێرش کردندا گونجاو و لەبارە هەروەك چۆن ناوچەی تەختانی لە بواری بەرگری کردنا بەکاردەهێنرێت.

ئەو وولاتەی کە بەسەر دەریادا دەروانێت بە ولاتێکی دەریایی دەناسرێتەوە خاوەنی کەشتی گەلێکی بازرگانی دەبێت کە لەکاتی ئاشتی و خاوەنی کەشتی گەلی سەربازی دەبێت لە کاتی جەنگدا (وەك بەریتانیا)، بە پێچەوانەوە ئەو وولاتانەی کە سنوری ئاویی یان نیە بایەخ بە بەهێزکردن و تۆکمەکردنی هێزی سەربازی ووشکانی دەدەن.[١٨]

دەتوانرێت بوترێت هەموو پایە رەگەزە سروشتی یەکانی هێزی دەوڵەت کاریگەرێتی بەردەوامی رێژەیی یان هەیە لەسەر سیاسەتی دەرەوە، ئەم پایەو

ڕەگەزانەش خۆیان لە پێگە، ڕووبەر، شێوە، ئاووهەوا، بەرزونزمی، سامانی سروشتیو... هتد دەبیننەوە.

ئەو وڵاتانەی کە پێگەکەیان بە وێستگە یان ڕێڕەوێك دادەنرێت لە جوڵانی پەیوەندی نێودەوڵەتیدا، یان کەوتوەتە سەر چەند دەریایەك، بایەخێکی گەورەو ستراتیجیان هەیە بۆ پشتگیری کردنو بەهێز کردنی سیاسەتی دەرەکی ئەو وڵاتانە.

هەروەها فراوانی ڕوبەری وڵات زۆر کات ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو وڵاتانە خاوەنی توانای زۆرو هەمە جۆرن لە ڕووی کەرەستەی خاو و بایەخی ستراتیجی سەربازی‌یەوە. بۆیە دەبینین ئەو وڵاتانەی کە خاوەنی ڕووبەرێکی فراوانی جوگرافین دەتوانن هێزێکی کاریگەر بن لە سیاسەتی نێو دەوڵەتیدا، لە کاتێکدا توانای ئەوەیان هەبێت ئەو ڕووبەرە فراوانەو کەرەستە ئابوریانەو هەمەچەشنی خاكو بەرزو نزمیەکەی بە شێوەیەکی وا بەکاربهێنێت کە ئامانجەکانی بهێنێتە دی (وەك ویلایەتە یەگرتووەکانی ئەمریکا).[١٩]

لەم ڕوانگەیەوە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە پێگەی جوگراف یان فراوانی ڕووبەروو کەشو ئاوو هەوای باش یان بوونی کەرەستەی سروشتی بێ سوودە گەر کرداری وەبەرهێنانو دەرهێنانو سوود لێوەرگرتن بە شێوەیەکی مۆدێرن بەکار نەهێنرێتو حکومەت یان ڕژێم ئەم فاکتەرانە نەخاتە خزمەتی وڵاتو کۆمەڵو بەهێزکردنی پلەپایەو پێگەی لە ژینگەی نێو دەوڵەتیدا. بۆ نموونە: ڕووبەری فراوانی وڵاتی سعودیە کە بە (٢٢٥٠٠٧٠) کیلۆمەتر چوارگۆشە دەژمێررێت، ئەم ڕووبەرە فراوانە چەندە هێزو تواناو داهات دەستە بەر دەکات لە هەمان کاتدا بووەتە خاڵی لاواز لە بواری کۆنترۆڵ کردنی ئاسایشی سنورە ووشکانی و ئاویو ئاسمانی‌یەکانی، لەبەر ئەوەی ڕووبەری خاکەکەی بە زۆریی بیابانەو بەربەستی سروشتی تێدا نیە بۆ بەرگری کردن جگە لە سروشتی ووشکی بیابان، هەر ئەمەشە وای کردووە کە زۆر هەستیار بن سەبارەت بە کێشەی بەرگریو ئاسایشی وڵات، بە تایبەت بەهۆی نزیکی سنوری باکور یان لە ڕژێمی جولەکەوە، فراوانی ڕووبەری جوگرافی وای لە ڕژێمی سعودیە کردوە چەندین ڕێکەوتننامەی سنوری لەگەڵ وڵاتانی دراوسێی‌دا ئیمزا بکات. هەروەها نەخشەکێشان بۆ پشت

بەستن بەهێزی دەریایی‌و ئاسمانی بەهێزو توندو تۆڵ دەتوانێت ئەو بۆشایی‌یەی بۆ پڕ بکاتەوە تا زاڵ بێت بەسەر کێشەی ڕووبەرە فراوان‌و درێژەکەی‌دا.[٢٠]

ئەمەش کاریگەریی فاکتەری جوگرافیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە هەندێ جار وڵات بە ناچاری سیاسەتێکی دەرەکی دیاریکراو دەگرێتەبەر. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەتوانین بڵێین فاکتەری جوگرافی لە ڕابردوودا بە یەکێك لە فاکتەرە بەردەوام‌و کاریگەرەکانی سیاسەتی دەرەکی دەژمێردرا، بەڵام ئەمڕۆ ئەو کاریگەرێتی‌یەی کەم بۆتەوە بەهۆی ئەو پێشکەوتنە بێ ئەندازەیەی کە جیهانی بەخۆیەوە بینیویەتی لە بواری تەکنەلۆجیاو پەیوەندی کردن‌و چەکسازی‌و بوارەکانی تردا.

## چوارەم:- فاکتەری دانیشتوان

سەرەتا دەبێت ئەو ڕاستیە بزانین کە کاریگەرێتی فاکتەری دانیشتوان لەسەر هەڵوێست‌و ڕەفتاری خاوەن بڕیار تەنها لە بواری چەندایەتیەوە لێك نادرێتەوە، بەڵکو لە بواری چەندایەتی‌و چۆنایەتی پێکەوە لێك دەدرێتەوە.

فاکتەری دانیشتوان بە فاکتەرێکی ماددی وبابەتی دێتە ژماردن کە کاریگەرێتی لەسەر دروستکردنی بڕیار هەیە.

بێگومان کاریگەرێتی‌و کاری فاکتەری دانیشتوان لە بڕو جۆرەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت، لە ڕووی چەندایەتی‌یەوە (بڕەکەی) کاریگەرێتی سەرەکی دەردەکەوێت لەمیانەی پەیوەندی ئەم فاکتەرەوە بە جۆری توانای ئابووری‌و سەربازی هەر دەوڵەتێك لە لایەك‌و توانای بەکارهێنانی وەك هۆکارێك بۆ ڕەوایەتی دانە پاڵ چەند ڕەفتارێکی دیاری کراو لە لایەکی ترەوە. بەڵام لە ڕووی چۆنایەتیەوە (جۆرەکەی) زیادبوونی ڕێژەی خوێندەوارو زاناو پسپۆڕان لە لایەك‌و زیاد بوونی تێکڕای تەمەن مام ناوەندەکان لە لایەکی ترەوەو بەرز بوونەوەی بەرهەم هێنانی تاکە کەس لە لایەکی ترەوە وا دەکات کە ژینگەی سیاسی خاوەن بڕیار زۆر لەبارو گونجاو بێت بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەکی.[٢١]

سیفەتە نەتەوەیی‌و نیشتمانیەکانی دانیشتوان کاریگەرێتیان هەیە لەسەر سیاسەتی حکومەت، بۆ نموونە: هەندێك لە گەلان بە ووشك‌و داخراو دەناسرێنەوەو هەندێکیان بە داهێنان و دەست پێشخەرو هەندێکی تریشیان

به گوێڕایەڵو نەرمونیان وەسف دەکرێن، ئەم سیفەتانە بە شێوەیەکی گشتی کاریگەرێتیان لەسەر سیاسەتی ناوخۆییو دەرەکی حکومەت هەیە.[٢٢]

هەروەها کاریگەرێتی دانیشتوان لە ڕووی چەندایەتیو چۆنایەتیەوە ڕۆڵی خۆی دەبینێت لەسەر هێزی دەوڵەت لە بواری سەربازیدا، بە شێوەی ئیجابی یان سەلبی، هەر بۆیە بڕیار بەدەستان فاکتەری دانیشتوان بە هەند وەردەگرن لە کاتی بڕیار دانادا.

دەتوانرێت بووترێت مرۆڤیش هەندێك جار وەك کەرەستەیەکی خاو دێتە هەژماردنو دەکرێت ڕێژەکەی بەکار بهێنرێت بە مەبەستی چاك کردنی چۆنیەتیو جۆرەکەی، ئەمەش بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندەواریو هۆشیاری مەشقو ڕاهێنانو ئامادەو ساز کردنی پسپۆڕو کرێکاران لە بواری پیشەسازیو کشتوکاڵیو خوێندنو فێرکردنو خزمەتگوزاریو... هتد دا، تا کاریگەرێتیو کارلێك کردنەکان پتەوو بەهێزبنو مەشقو ڕاهێنانو ئامادە باشیەکان هاوشانی ئەو پێشکەوتنو زیادبونە بەرچاوە بن کە جیهانی هاوچەرخ بەخۆیەوە بینیویەتی، ئەمەو ژمارەی دانیشتوانی جیهان بەپێی سەرژمێری نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی (٢٠٠٠)دا گەیشتووەتە شەش ملیار کەس، کە تا ئێستاش لە زیادبووندایە، ئەمەش ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ زیاد بون و گران بوونی ئەرکی حکومەتو کاربەدەستان بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی ئەو تەقینەوەیەی دانیشتوان کە جیهان بەخۆیەوە دەیبینێت، ئەم زیاد بوونەش کار دەکاتە سەر سیستمی سیاسیو ڕەوتی سیاسەتی دەرەکی هەندێك وڵات دیاریو سنوردار دەکات.

فاکتەری دانیشتوان کاتێك بە ئیجابی لە قەڵەم دەدرێت کە لە ڕووی چەندێتیو چۆنێتییەوە هاوتاو گونجاو بێت لەگەڵ توانا ئابورییو خۆیەکیەکانی وڵات، ئەگەر وانەبێت ئەوا پێچەوانەکەی ڕوو دەداتو بەزیانی هاووڵاتیان لە لایەكو حکومەتیش لە لایەکی دی دەشکێتەوە. ئەمەو فشاری دانیشتوان لەو وڵاتانەدا دێتە دی کە سامانی ئابورییان بە شێوەیەکی چاك بەکارنەهێنرێت، یان کەسانی پسپۆڕو شارەزایان کەمو دەگمەنە بۆ وەبەرهێنانی سامانی نەتەوەییان، ئەمەش یان بەهۆی لاوازی توانای بڕیار بەدەستانەوەیە یاخود بەهۆی نەبوونی ئەو سامانە ئابوریەیە کە هێزی مرۆیی تێیدا بەکار دەهێنرێت، ئەمەش دەبێتە مایەی کۆچکردنی

دانیشتوان بەرەو وڵاتانی تر یان دەبێتە مایەی هەڵگیرسانی جەنگی فراوانخوازی بۆ دەستگرتن بەسەر خاکی وڵاتانی تردا بۆ ئەوەی بتوانن سود لە سامانی ئەو وڵاتانە وەربگرن و توانا مرۆییە زیادەکەی خۆیان بخەنە گەڕ تێیدا.[٢٣]

ئەو وڵاتانەی کە بەهۆی کێشەی کەمی ژمارەی دانیشتوانەوە دەناڵێنن یان کێشەی نەبوونی کادیرو کەسانی پسپۆڕو ڕاهێنراویان هەیە، ناتوانن سەرچاوە ئابوریەکانیان بە شێوەیەکی چاك بەکار بهێنن، ئەمە جگە لەوەی کە ناتوانن ڕووبەڕووی پێشهات و هەلومەرج و هەڕەشە دەرەکیەکان ببنەوە، سەرەنجام ئەم دەوڵەتانە ناچار دەبن کە پەیوەست بن بە چەندین ڕێکەوتن نامەو هاوپەیمانێتی ئەو تۆوە کە بڕیاری سیاسی دەرەکیان بخاتە ژێر فشارو مەرجی هێزو لایەنە دەرەکیەکانەوە. نموونەش لەم بوارەدا زۆرە، ئەوەتا ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا دەسەڵات و توانای ئابوری و سیاسی و سەربازی خۆی بەسەر زۆرێك لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا سەپاندووە، دیارترینشیان وڵاتانی کەنداون، ئەم سیاسەتە پاوانخوازیە وای کردووە ئەو دەوڵەتانە بکاتە پاشکۆی خۆی لە زۆربەی بوارەکاندا. لە ژێر ڕۆشنایی ئەم باسەدا بۆمان دەرکەوت کە فاکتەری دانیشتوان بەجۆرێك لە جۆرەکان کار لە هەڵوێست و ڕەفتاری بڕیار بە دەستان دەکات لە هەموو دەوڵەتێکدا، بە تایبەت لەم قۆناغەدا بەهۆی پێشکەوتنی زۆری بواری تەکنەلۆجیاو زانست و پەیوەندی کردن و هۆشیاری و ئایدولوجیاو بیروباوەڕەوە...

لەبەر ئەوەی مرۆڤ بە یەکێك لە کەرەستە خاوەکان دەژمێردرێت بۆ دەوڵەت، پێویستە لەسەری هەوڵ بدات بە چاکترین شێوە سوود لە ووزەو تواناو بەهرەکانی وەربگرێت و بیکاتە ئامرازێکی کاریگەر بۆ بەدیهێنانی ئامانجە سیاسیە دەرەکیەکانی، بۆ ئەوەی دواتر ببێتە یەکێك لە ڕەگەزە سەرەکیەکانی هێزو توانای دەوڵەت.

## باسی دووەم

## فاکتەرە کۆمەڵایەتیەکان

لەمیانەی ئەم باسەدا بە شێوەیەکی بابەتیانە لە دیارترین ئەو فاکتەرە کۆمەڵایەتیانە دەکۆڵینەوە کە کارگەرێتی ڕوون و ئاشکرا لەسەر بڕیاری سیاسی دەرەکی بەجێ دەهێڵن، هەوڵ دەدەین باس لە هەریەك لەمانەی خوارەوە بکەین:-

- ڕای گشتی.
- هۆکارەکانی پەیوەندی کردن.
- حیزبە سیاسیەکان.
- گروپەکانی فشار.
- جۆری سیستمی سیاسی.
- زانکۆو ناوەندەکان لێکۆڵینەوە.

### یەکەم:- ڕای گشتی Public Opinion

ڕای گشتی یەکێکە لەو فاکتەرانەی کە کاریگەرێتیان هەیە لەسەر سیستمی سیاسیو دەسەلات، بە تایبەت لە بواری سیاسەتی دەرەکیدا.

ڕای گشتی بە واتای ڕاوبۆچوونی تاکەکان لەمەڕ کێشە گشتیو دیاری کراوەکاندا لە بواری سیاسەتدا، لە ڕوانگەی ئەم پێناسەیەوە، ڕای گشتی پەیوەستە بە کێشە گشتیەکانەوە، واتە جێگای گرنگی پێدانی ئەندامانی کۆمەڵە بەگشتی، بەلام ئەم کێشانە سروشتێکی دیاریکراویان هەیە.[٢٤] (هادي العلوي) بەم شێوەیە پێناسەی (ڕای گشتی) دەکات: ((کۆی ڕاوبۆچوون و هەڵسەنگاندنی گشت چین و توێژەکانی دانیشتوانە لەمەڕ مەسەلە گشتیەکاندا)). ڕای گشتی لە (نهج البلاغة)دا بە واتای (زاری خەڵکی) – السنة الخلق – هاتووە.[٢٥] بەو مانایەی ڕای گشتی ئاماژەیە بۆ هەڵوێستی جەماوەری خەڵکی سەبارەت بە کێشەیەکی دیاریکراو، هەر بۆیە داڕێژەرانی بڕیاری سیاسی هەوڵ دەدەن ڕای گشتیو ناوەڕۆك و

ئاراستەکانی ڕوون و ئاشکرا بێت لایان. ڕای گشتی لەو کاتانەدا سەرهەڵدەدات کە خەڵکانێك هەوڵی زانینی دەدەن، زۆربەی حکومەتەکانیش پێیان وایە کە کۆکردنەوەی پشتگیری کارێکی پێویستە بۆ سیاسەتی دەرەکیان.

هاوڵاتی ئاسایی بایەخێکی کەم دەدات بە کاروباری سیاسەتی دەرەکی، بۆیە یاریکردن بەڕای گشتی لە کاروباری دەرەکیدا کارێکی ئاسانترە وەك لە کاروباری ناوخۆیی.[٢٦] بە تایبەت لە وولاتە دکتاتۆری و تۆتالیتاریەکاندا کە دەوڵەت هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی بۆ خۆی قۆرخ کردووە، ئەم هۆکارانەش سەرچاوەی سەرەکی زانیاری زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵن، بەڵام لەو وولاتانەی کە ڕۆژنامەی ئازادو کەناڵی سەربەخۆی تێدایە، حکومەت بە هەمان شێوە پێویستی بە زانین و ئاراستە کردنی ڕای گشتی هەیە، بەڵام هەوڵ و کۆششێکی زۆر بە خەرج دەدرێت بۆ بەدیهێنانی پشتگیری جەماوەری. لەبەر ئەوەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن ڕاو بۆچوونی دژو نەیارو جۆراو جۆر بڵاو دەکەنەوە.

ڕای گشتی بە یەکێك لە ڕەگەزەکانی سیاسەتی دەرەکی دادەنرێت، ئەمەو ڕەوایەتی دەسەڵات و پاساوی مانەوەی بە تایبەت لە وولاتانی جیهانی سێهەمدا، زیاد لە هەر کاتێکی تر پێویستی بە پشتگیری ڕای گشتی هەیە، ئەمەو هەرچەندە لە وولاتانی جیهانی سێهەم ڕای گشتی لەلایەن دەسەڵاتی سیاسیەوە دروست دەکرێت، لەبەر ئەوەی دەوڵەت کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی بەدەستەو دەتوانێت لەمیانەیانەوە ڕای گشتی بهێنێتە دی، یان کاربکرێت بەڕای گشتی پێشووی گۆڕەپانی سیاسی و سوود لێوەرگرتنی، بەمەبەستی ڕازیکردنی خەڵکی بە بەڵگەو دیدو بۆچوونەکانی خاوەن بڕیار.[٢٧]

ڕای گشتی بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لەو مەسەلەو هەڵوێستانەدا دەردەکەوێت کە پەیوەندیان بە بەرژەوەندیە نەتەوەییەکانەوە هەیە، کە وا دەخوازن بڕیارێکی سیاسی دەرەکی توند دەر بکرێت، بە شێوەیەك هەلومەرج بڕەخسێنێت بۆ خاوەن بڕیار تا ئەو هێزانەی پاڵپشتی بڕیارەکە دەکەن لە دەوری کۆببنەوە بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی ئەو هەڕەشانەی کە لە بەرژەوەندیەکانیان دەکرێت. لەگەڵ ئەوەدا کە فەرامۆش کردنی ڕای گشتی لەلایەن دروستکەری بڕیارەوە هەمیشە شکستی بڕیارەکە ناگەیەنێت، ئەو

فەرامۆش کردن و گرنگی پێنەدانە سەر دەکێشێت بۆ ئەوەی ناوەندەکانی ڕای گشتی پاشەکشە بکەن لە پشتگیری و پشتیوانی کردنی بڕیارەکە لە کاتێکدا بڕیارەکە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیاندا یەك نەگرێتەوە، جاری واش هەیە ئەم ناوەندانە ڕووبەڕووی دەسەڵاتداران دەبنەوە، وە هەندێ جار هەوڵ دەدەن بۆ گۆڕینی دەسەڵاتی خاوەن بڕیار بە هەموو شێوازە تەقلیدیەکان، لەوانە کاری شۆڕشگێڕی.(٢٨)

لەم میانەیەوە ئەوە دوپات دەکەینەوە کە هەموو سیستمێکی سیاسی، بێ گوێدانە سروشت و ئاستی بڕوا بوونی بە جەماوەر، دەبێت گرنگی ڕای گشتی و ئاڕاستەکانی لەبەرچاو بگرێت، هەرچەندە بە ڕێژەیەکی کەمیش بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا کە قوتابخانەی ڕیالیزمی پێ ی وایە کە ڕای گشتی بە چەند تایبەتمەندیەکی دیاریکراو جیادەکرێتەوە لە سیاسەتی دەرەکیدا، گرنگترینیان:-

١-نەبوونی زانیاری پێویست و ئەو ڕاستیە بنچینەیی یانەی پەیوەستن بە سیاسەتی دەرەکیەوە لای هاوڵاتیان.

٢-بایەخ نەدانی هاوڵاتیان بە کێشەکانی سیاسەتی دەرەکی، مەگەر بە شێوەیەکی سادەو کەم نەبێت. ڕێژەی ئەم بایەخدانەش لە کاتی قەیران و تەنگژە نێودەوڵەتیەکاندا زیاد دەکات و لە کاتی ئاساییدا کەم دەبێتەوە.

٣-ئەم قوتابخانەیە ئەوەی دووپات کردۆتەوە کە دروستکەری بڕیاری سیاسی کار دەکاتە سەر ڕای گشتی زیاتر لەوە کە کار بکرێتە سەری، زۆرجاریش بە پێچەوانەی ڕای گشتیەوە ڕەفتار دەکات.(٢٩) هەرچەندە بەڵگەو بۆچوونەکانی ئەم قوتابخانەیە بەهێزە بەڵام ناکرێت بە حوکمێکی گشتی لەسەر کاریگەرێتی ڕای گشتی لەسەر سیاسەتی دەرەکی، چونکە کاریگەرێتی ڕای گشتی لە ڕژێمێکەوە بۆ ڕژێمێکی تر دەگۆڕێت، هەروەها بەپێ ی گۆڕانی کێشەکانی سیاسەتی دەرەکی و ئاستی یەك دەنگی ڕای گشتی لەسەر ئەو کێشانە دەگۆڕێت.

پاش ئەو گۆڕانکاریە گرنگ و ناوازانەی کە لە بواری تەکنەلۆجیاو هۆکارەکانی پەیوەندیکردن و گەیاندندا هاتووەتە دی، بە تایبەت دوای ڕووداوی ١١/سێبتەمبەری/٢٠٠١ ڕێژەی بایەخدان بە ڕووداوە نێو دەوڵەتیەکان لەنێو وڵاتاندا ڕوو لە زیاد بوونە.

((هولستی)) پێی وایە ئەو سیستمە سیاسیانەی کە حکومەت تێیدا بالادەستە بەسەر هەموو سەرچاوەکانی زانیاریو راگەیاندندا رای گشتی تێدا دەگۆڕێت بۆ هێزێکی پشتیوانی سیاسەتی دەرەکی، لەبەر ئەوەی جەماوەر هیچ بیرو بۆچونێکی جیاوازی نیە لەوەی کە دەسەلات گوزارشتی لێوە دەکات، هەروەها خەلکی خۆی وا دەبینێتەوە کە هەلگری هەمان راو بۆچوونو ئاراستەیە کە حکومەت هەیەتی.[٣٠]

بەلام قوتابخانەی (لیبرالی) جەخت دەخاتە سەر ئەوەی رای گشتی کاردەکاتە سەر رەوتی سیاسەتی دەرەکیو چوارچێوە گشتیەکانی ئەو سیاسەتەو جۆری هەلبژاردنەکەی.[٣١]

رای گشتی پال بە دارێژەری سیاسەتی دەرەکیەوە دەنێت تا بایەخ بە کێشەیەکی دیاریکراو بدات، هەروەها کار لە ئاستی پێزانینو تێگەیشتنی بڕیار بەدەست دەکات بۆ ئەو کێشەیە، واتە ریزبەند کردنی یە کەمایەتی (أولويات) کێشەکان لای دارێژەری سیاسەتی دەرەکی دیاری دەکات، هەروەك چۆن چوارچێوە سەرەکیەکانی بۆ دروست کەری بڕیار دیاری دەکات بۆ ئەگەرو بژاردە گونجاوەکان. هەروەها رای گشتی کار دەکاتە سەر جۆری بژاردە سیاسیەکان کە دروستکەری بڕیاری سیاسی دەرەکی دەیکاتە بنەمای کارکردن.

لەمیانەی ئەم باسەدا گەیشتینە ئەو دەرەنجامەی کە پەیوەندیەکی ئالوگۆڕکراو لە نێوان حکومەتو رای گشتیدا هەیە، واتە هەردووکیان کار لە یەکتری دەکەن، هەروەها هێزی کارتێکردنی رای گشتی لەسەر بڕیار بەدەست لەسەر چەند فاکتەرێك وەستاوە، لەوانە:-

١- سروشتی سیستمی سیاسی. ٢- جۆری رۆشنبیری سیاسی باو.

٣- سروشتی بارودۆخی دەوروبەری هەلوێستەکە.

ئەمەو خاوەن بڕیار دەتوانێت کار لە رای گشتی بکات لەمیانەی تواناو کەنالەکانی راگەیاندن کە راستەوخۆ و خێرا کاریگەری دروست دەکەن، یاخود لەمیانەی ئەو هۆکارانەی کە کاریگەریتییان دوور خایەنە وەك هۆکارەکانی پێگەیاندنی سیاسی (التنشئة السياسية)[٣٢]. وەك خێزان و قوتابخانەو فێرگەو سوپا... هتد.

## دووەم:- هۆکارەکانی پەیوەندی کردن

لە سایەی ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆجیو زانستیە خێراو بەرچاوانەی کە جیهانی هاوچەرخ بەخۆیەوە بینیوە، هۆکارەکانی پەیوەندی کردن لەو بوارەدا پشکێکی زۆری بەرکەوتووەو پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە کە لە زۆر بواری جیاجیای وەك ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، ڕۆژنامە، کتێب، بڵاوکراوەکانی، کۆمپیوتەرو ئینتەرنێتدا ... هتد خۆی دەبینێتەوە.

هەریەکێك لەم هۆکارانە بەجۆرێك لە جۆرەکان کاریگەری لەسەر بڕیار بەدەستان دروست دەکەنو دواتر لەسەر سیاسەتی دەرەکیش کاریگەریان دەبێت، ئەم کاریگەریەش بەڕێگای ورووژاندنو هۆشیارکردنەوەو دروستکردنی ڕای گشتی دەبێت لە ڕێگای گواستنەوەی زانیاریو ڕاستیەکانو ڕوونکردنەوەی کێشەو هەڵوێستو هەلومەرجە سیاسیە دەرەکیەکانی دەوڵەتەوە.

ئەم کاریگەرێتیەش بەپێی ئەو سیستەمە سیاسیەی تێیدا پەیڕەو دەکرێت لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر دەگۆڕێت.

یاخود کاریگەریەکە بەڕێگەی تر دەبێت، بۆ نموونە کاتێك میدیاکانو ئامرازەکانی پەیوەندی کردن وەك ئامرازێك بەکاردەهێنرێن بۆ جەنگی دەرونیو پڕوپاگەندە لە لایەن دەوڵەتانەوە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە سیاسیە دەرەکیەکانو فشار خستنەسەر لایەنی بەرامبەر.

لە ڕاستیدا هۆیەکانی ڕاگەیاندن لە هەندێ کاتداو لە هەندێ سیستەمی سیاسی دیموکراسیدا کە بە دەسەڵاتی چوارەم دادەنرێن ڕۆڵێکی کاریگەر دەگێڕن لە ژیانی سیاسیدا، بەڵام لە دەوڵەتە تۆتالیتاریو دکتاتۆریەکاندا هۆیەکانی ڕاگەیاندن لە لایەن دەسەڵاتی فەرمانڕەواوە قۆرخ کراونو بەکاریان دەهێنن بۆ بەدیهێنانی ئامانجو بەرژەوەندیەکانیانو گوزارشت لەڕاو بۆچوونو ئایدیاکانی دەسەڵاتداران دەکەن، واتە ڕاگەیاندن هیچ شتێك لە دژی دەسەڵات ناڵێت، بەڵکو لەخزمەتی دەستەی فەرمانڕەوادا کار دەکات.[٣٣] لەم حاڵەتەشدا هۆیەکانی ڕاگەیاندن دەبنە دار دەستی دەسەڵاتو کارو ئەرکی سەرەکی خۆیان لە دەست دەدەن.

گەر بپرسین کێ کاری پەیوەندی کردن (الاتصال) ئەنجام دەدات؟ دەتوانین بڵێین: هەر کۆمەڵو گروپێك بە مەبەستو تێگەیشتنەوە هەوڵ بدات

کاریگەری لەسەر سیاسەتی حکومەت دروست بکات بە دەستەی سیاسی پەیوەندی کردن دەژمێررێت، هەروەك چۆن هەندێك لەو کۆمەڵانەش کە بەبێ مەبەستو مەرامێك کاریگەری لەسەر دەسەڵات دروست بکات بە کۆمەڵێکی سیاسی پەیوەندی کردن دادەنرێت.(٣٤)

لە سیستمە دیموکراسیەکاندا پارتەکانو گروپەکانی فشار بە دیارترین دەستەکانی پەیوەندی کردن دادەنرێن، پەیوەندی کردن چەکێکی زۆر مەترسیدارە بەدەست هەر گروپو لایەنێکەوە کە بیەوێت کاریگەریو فشار لەسەر داڕێژەرانی بڕیاری سیاسی دروست بکات.

هۆیەکانی ڕاگەیاندن بە شێوەیەکی گشتیو ڕۆژنامە بە شێوەیەکی تایبەتی ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن لە کار کردنە سەر پرۆسەی داڕشتنی سیاسەت، ئەمەش بە شیکردنەوەی هەڵوێستو سیاسەتەکانی بڕیار بەدەستانو کۆکردنەوەی پشتگیری دەبێت بۆیان لە لایەكو لە لایەکی ترەوە میدیاکان هۆکارێکن کە دەکرێت لە ڕێگەیانەوە ئاراستەو بۆچوونەکانی ڕای گشتیو گروپە جیاوازەکانی بەرژەوەندی، بگاتە دەست داڕێژەرانی سیاسەت (واتە دەسەڵات)، لە لایەکی تریشەوە ئەم هۆکارانە ڕۆڵێکی سەربەخۆ دەبینن لە دروست کردنو سازدانی ڕای گشتیو ڕای بڕیار بەدەستان سەبارەت بە کێشەو دۆزە سیاسیە دەرەکیەکان.(٣٥)

لەم میانەیەدا بینیمان کە پەیوەندییەکی بەهێزو گرێدراو هەیە لە نێوان ڕای گشتیو پەیوەندی کردندا، پەیوەندی کردن بە هەموو چەمكو جۆرە جیاجیاکانیەوە ئامادە باشیەکی هەمیشەیی بەرجەستە دەکات لە هەموو ئەو بابەتانەدا کە پەیوەندی بە ڕای گشتییەوە هەیە، چونکە بەبێ پەیوەندی کردن ڕای گشتی دروست نابێت، جا جۆرو ئاستی پێشکەوتوویی ئەو پەیوەندی کردنە هەر چۆنێك بێت، کۆن بێت یان نوێ، هەروەك چۆن بەبێ هۆیەکانی پەیوەندی کردن چاودێری هەڵسەنگاندنی پێوانی ئاستی ڕای گشتی ناکرێت. لەبەر ئەوە ئەگەر عەقڵی فەلسەفی دوێنێ جەختی لەسەر وتە بەناوبانگەکەی دیکارت دەکردەوە کە دەڵێت: ((من بیردەکەمەوە کەواتە من بوونم هەیە))، ئەوا ئەمڕۆ عەقڵی مرۆڤ جەخت لە وتەی ((من پەیوەندی دەکەم کەواتە من بونم هەیە)) دەکاتەوە(٣٦) لە ڕاستیدا ڕاگەیاندنو هۆیەکانی پەیوەندی کردن ڕۆڵێکی سەرەکی دەگێڕن لە بەرچاو ڕۆشن کردنی ڕای

گشتی و ئاراستەکردنیدا، هەروەها میدیاکان دەتوانن پردگەلی گفتوگۆو ئالوگۆڕکردنی زانیاریو پەیوەندی کردنی نێوان داڕێژەرانی بڕیاری سیاسیو ڕای گشتی دروست بکەن. کەواتە چونە ناوەوەی میدیاکان بۆ دامو دەزگاکانی داڕشتنی بڕیاری سیاسی ڕۆڵێکی زۆریان دەبێت جا سلبی بێت یان ئیجابی. لێرەوە دەتوانرێت بووترێت هۆیەکانی پەیوەندی کردن یان هۆکارێکی بەهێزکردنو پاڵپشتکردنی سیستمی سیاسین، ئەمەش لە کاتێکدا دەبێت کە میدیاکان لە لایەن دەسەڵاتەوە قۆرخ کرابن، وەك لە سیستمە دیکتاتۆریو تۆتالیتاریەکاندا هەیە، یاخود هۆکارێك دەبن لە هەندێ کاتدا بە دەست پارتەکانو گروپەکانی فشارەوە بۆ کاریگەریو فشار خستنە سەر دەسەڵاتو بڕیار بەدەستان، وەك لە وڵاتە دیموکراسیەکاندا هەیە. واتە لەم حاڵەتەدا ئەو هۆکارانە بواری فشار خستنە سەر دەسەڵاتیان هەیە. هەر چۆنێك بێت بڕیار بەدەست هەمیشە هەوڵ دەدات ماددەکانی ڕاگەیاندن بە باشترین شێوە وەبەر بهێنێتو سوودیان لێ وەربگرێت، ئەمەش لەم خاڵانەدا دەردەکەوێت[٣٧]:-

١- دەستخستنی زانیارییە بەسودەکان بۆ دروستکردنی بڕیارو ناسینی ڕاو بۆچوونەکانو پێشهاتە نوێیەکان.

٢- چڕکردنەوەی گرنگی دانو دروستکردنی کەشو هەوایەکی گونجاو بۆ وەرگرتنی بڕیارەکە.

٣- ڕاگەیاندنی بڕیارو بەدوادا چوونی.

بەم شێوەیە ڕێژەو ئاستی گرنگیدانی بڕیار بەدەستمان بۆ دەردەکەوێت، کە دەیانکەنە میکانیزمی خزمەتکردنی بەرژەوەندیەکانیانو ڕاکێشانی ڕای گشتی بەلای خۆیاندا، زۆر کاتیش بڕیار بەدەستان مەترسی زۆریان دەبێت لە میدیاکان تا گەیشتۆتە ڕادەیەك سەرکردەیەکی وەکو ناپلیۆن بڵێت ((ئەوەندەی لە سێ ڕۆژنامەی نەیار دەترسم لە هەزار تانكو دەبابە ناترسم)).

## سێهەم/ حیزبە سیاسیەکان Political Parties

هەموو حیزبێکی سیاسی بەرنامەو ئامانجگەلێکی دیاریکراوی هەیە، کە ڕەنگدانەوەی بەرژەوەندی چینێك یان چەند چینێکی کۆمەڵگایەو هەوڵو خەبات دەکات بۆ دابینکردنی ئامانجو بەرژەوەندیەکانی لەمیانەی ناوەندی دروستکردنی بڕیاری سیاسیدا، هەر بۆیە حیزبە سیاسیەکان لە ڕووی

ئامانج و بەرژەوەندیەوە جیاوازیان هەیە بەپێی جیاوازی ئەو چین و توێژە کۆمەڵایەتیانەی کە سەر بە حیزبن، یان تێدەکۆشێت لە پێناو بەدیهێنانی ئامانج و بەرژەوەندیەکانیدا لەمیانەی کارتێکردنی لەسەر ڕەفتاری بڕیار بەدەست.

ڕۆڵی حیزبەکان بەرەو زیاد بوون و گەشەسەندن ڕۆیشتووە لە قۆناغی ئەمڕۆدا لەچاو ڕابردوودا، لە ئەنجامی ئەو گەشە سەندنە کۆمەڵایەتی و شارستانیەی هاتۆتە دی، ئەمەو حیزبەکان ئامانجیان گرتنە دەستی دەسەڵاتە تا بگەنە ناوەندی دەسەڵات و بڕیاردان لە پێناو جێبەجێکردنی ئامانجەکانیاندا.

لە کاتێکدا حیزب دەسەڵات دەگرێتە دەست و داموو دەزگاکانی دەوڵەت و کۆمەڵگەی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، حیزب دەبێتە ڕەگەزێکی زۆر کاریگەر لە بڕیاردانی سیاسیدا، ئەگەر نەڵێین تاکە ڕەگەزە، ئەمە بەڕەچاوکردنی کاریگەرێتی فاکتەرەکانی تری ژینگەکە.(٣٨)

لێرەدا پێویستە بزانین کە فشار خستنە سەر ناوەندی دروستکردنی بڕیار لەلایەن حیزبە سیاسیەکانەوە، یان بەشداری کردن لە دروستکردنی سیاسەتی دەرەکیدا لە سیستمێکەوە بۆ سیستمێکی تر دەگۆڕێت. دەبینین هەندێك لە حیزبەکان ڕاستەوخۆ هەڵدەستن بە دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی یان بەشداری دەکەن لە ئامادەکردنیدا، لە هەندێك وڵاتی تردا ڕووبەڕووی بڕیار بەدەستان دەبنەوە. تێبینی ئەوە دەکرێت کە حیزبە سیاسیەکان لە کاتێکدا بەر پرسیارێتی دروستکردنی سیاسەتی دەرەکی لە وڵاتەکانیاندا دەگرنە دەست بە یەکێك لەم دوو ئاڕاستەیەی خوارەوەدا هەنگاو دەنێن:-(٣٩)

<u>ئاڕاستەی یەکەم</u>:- ئەو حیزبانەی لە کارکردنیاندا لە بنەما نەگۆڕەکانی ئایدۆلۆجیایان لانادەن لە کاتی دروستکردنی سیاسەتی دەرەکیدا، واتە سیاسەتی دەرەکیان ڕەنگدانەوەی بنەما ئایدۆلۆجیەکانیان دەبێت.

<u>ئاڕاستەی دووەم</u>:- ئەم حیزبانە کاتێك دەسەڵاتی سیاسی دەگرنە دەست لە وڵاتەکانیاندا دوور دەکەونەوە لەو بەرنامە سیاسیەی کە لە قۆناغی پێشوودا بانگەشەیان بۆ کردووە لە کاتێکدا کە لە ڕیزی ئۆپۆزسیۆندا بوون،

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو بەرنامانە تەنها ئامرازێکن لە کاتی هەڵبژاردندا بەکاردەهێنرێن بە مەبەستی دەسکەوتی سیاسی.

لە ڕاستیدا دەبینین ئەو سیستمە سیاسیانەی کە پشت بە سیاسەتی حیزبی فەرماندە (الحزب القائد) یان سیاسەتی تاکە حیزب (الحزب الواحد) دەبەستن، لەگەڵ ئەو جیاوازیەشدا کە لە نێوان ئەم دوو جۆرە حیزبەدا هەیە، حیزب ڕۆڵی فەرماندەیی دەبینێت لە پرۆسەی بڕیاردانرا، وە کاریگەرێتی حیزبە سیاسیە نەیارەکان کەمو لاوازەو لە ڕیزی نەبوندایە، بۆ نموونە/ سیستمە تۆلیتاریەکان. بەڵام لە سیستمی لیبرالیدا حیزبەکان لەسەر ناوەڕۆکی سیستمی سیاسیو ڕەفتاری سیاسی دەرەکی کۆكو تەبان، هەرچەندە جیاوازیان لە نێواندا هەیە لەسەر هەندێ مەسەلەی سادەو لاوەکی، بەزۆری ئەم مەسەلانەش نێوخۆیین و وەك کەرەستەیەکی بنچینەیی بەکار دەهێنرێن لە کێبەرکێی هەڵبژاردندا.[٤٠] بۆ نموونە: لە وڵاتە دیموکراسیەکاندا حیزب بە بنەمایەکی سیاسی سەرەکی دادەنرێت لە سیستمی سیاسیدا، چونکە بوونو ڕەوایەتی خۆی لە جێبەجێکردنی ئەرکو فەرمانەکانو توندو تۆڵی ئەو پەیوەندیانەی کە لە نێوان کۆمەڵگەو سیستمی سیاسیدا دروستی دەکات وەردەگرێت.[٤١]

ڕۆڵی ئەو حیزبانەی کە لە ئۆپۆزسیۆندان کاریگەرێتیان جیاوازە لە سیستمێکەوە بۆ سیستمێکی تر، ڕۆڵو کاریگەرێتیان لە سیستمی سیاسی تاکە حیزبدا نیەو لە سیستمی سیاسی دوو حیزبدا لاوازە، بەڵام لە سیستمی فرە حیزبیدا ڕۆڵی بەرچاویان هەیە. ئەگەر سەیری سیستمی سیاسی تورکیا بکەین دەبینین حیزبە سیاسیەکان ڕۆڵێکی گەورە دەبینن لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاردا، جا ئەو حیزبانەی بەشدارن لە حوکمدا لەڕێی نوێنەرو وەزیرەکانیانەوە بەشداری دروستکردنی بڕیار دەکەن، یان ئەو حیزبانەی تر کە لە ڕیزی ئۆپۆزسیۆندان بەو ڕۆڵە گشتیەی کە دەیبینین، ئەمە جگە لە گرنگیو ڕۆڵی حیزبەکان وەك میکانیزمێکی سەرەکی لە تەجنیدی سیاسیدا.[٤٢]

لە کۆتاییدا دەتوانرێت بووترێت ڕۆڵی حیزبەکان لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاردا دەگۆڕێت بەپێی بەشداری کردنی ئەو حیزبە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، یان نەیاری پرۆسەکەیە، یاخود بەشداری تێدا

دەکات بەهەر ئاستو جۆرێك بێت، ئەمەش لە سیستمێکی سیاسیەوە بۆ سیستمێکی تر دەگۆڕێت.

ئەمەو جیاوازییەکی سەرەکی هەیە لە نێوان حیزبەکانو گروپەکانی فشار لە ڕووی ئەوەوە کە حیزبەکان تێدەکۆشن بۆ گەیشتن بە دەسەلاتو ومارەسە کردنیو جێبەجێکردنی بەرنامەو ئامانجەکانیان، بەلام گروپەکانی فشار مەبەستیان فشارو کاریگەری خستنە سەر داڕێژەرانی بڕیارو سیاسەتە بەبێ ئەوەی هیچ لێپرسراوێتییەك بخەنە ئەستۆی خۆیان. لێرەدا دەکرێت بپرسین ئایا گروپەکانی فشار کاریگەریان هەیە لەسەر دروستکردنی بڕیاری سیاسیی دەرەکی؟

## چوارەم:- گروپەکانی فشار Pressure Groups

گروپەکانی فشار بریتین لە چەند گروپێکی کۆمەلایەتی ڕێکخراو، کە چەندین هۆکاریان لەبەر دەستدایە بۆ گوزارشت کردن لە بەرژەوەندیەکانیانو چەند شێوازێکی جۆراو جۆر بۆ مومارەسەکردنی فشارەکانیان بەشێوەی ڕەسمیو نارەسمی بەکاردەهێنن. واتە گوزارشت لەڕاو بۆچونەکانیان دەکەن بە شێوەی ڕێکخراو یان نارێکخراو، ئاشکرا یان نهێنی، بە مەبەستی کار کردنە سەر ئاراستەی جموجۆلی سیاسی بڕیار بەدەستان بە شێوەیەك لە خزمەت بەرژەوەندیو ئامانجەکانیاندا بێت، ئەمە لە کاتێکدا کە گروپەکانی فشار هیچ بەرپرسیارێتییەکی ڕاستەوخۆ لە دەسەلاتدا ناگرنە ئەستۆی خۆیان.[٤٣]

گروپەکانی فشار لە زۆربەی کۆمەلگاکاندا بونیان هەیەو لە وولاتە پێشکەوتووە ڕۆژئاواییەکاندا توانیویانە سەرکەوتنی گەورە بەدەست بێنن. بەرژەوەندی گروپەکانی فشار بەپێی جۆرو شێوەکانیان دەگۆڕێت، هەروەك چۆن لەڕووی ئامانجیشەوە جیاوازیان هەیە. بۆنموونە: گروپەکانی فشار لە بواری ئابوریدا هاوسەنگی دەکەن لە نێوان بڕیاری سیاسی دەرەکیو ئاستی کاریگەری ئەو بڕیارە لەسەر بەرژەوەندیە مادیەکانیان جا ئەو کاریگەریە سەلبی بێت یان ئیجابی.

بەلام گروپەکانی فشار لە بواری سیاسیدا زۆر کات پەیوەندیەکی مەعنەوی لەگەل چەند دەولەت یان چەند هێزێکی بیانیدا گرێ دەدەن کە خزمەتی بەرژەوەندیەکانیان بکات لە ڕێی کارکردنە سەر بڕیاری سیاسیەوە

به چەندین هۆکارو ئامراز، کە یارمەتی بدات لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیاندا، وەك لۆبی یەهودی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.[٤٤] لۆبی یەهودی (٣٪)ی دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێك دێنن، بەڵام (٩٧٪)ی کەناڵەکەمانی ڕاگەیاندن لەژێر رکێفیاندایە.[٤٥] ئەمەش سەردەکێشێ بۆ ئەوەی بەو پرۆژەیە کار لە سیاسەتی دەرەوەی ئەو وڵاتە بکەن بەشێوەیەك ئامانج و بەرژەوەندیەکانیان بە باشترین شێوە بهێنێتە دی.

ڕۆڵی گروپەکانی فشار لە وڵاتانی جیهانی سێدا جیاوازە لە وڵاتانی تر، ئەمەش بەپێی سروشتی سیستمی ئەو دەوڵەتانە دەگۆڕێت، یان ڕۆڵیان نابێت، یان ڕۆڵێکی ئاشکرایان دەبێت، یاخود ڕۆڵێکی شاراوە دەبینن. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند ڕاستیو هۆکارێکی مێژوویی و دەروونی و ڕۆشنبیری و تەکنیکی و سیاسی جیاواز.

لە ڕووی شێوازەوە پۆلێن کردنی گروپەکانی فشار بەپێی ئەو پێوەرەی کە پۆلێنی پێ دەکرێت دەگۆڕێت، هەر چۆنێك بێت بە شێوەیەکی گشتی دەکرێت پۆلێنی گروپەکانی فشار بکرێت بۆ دوو جۆر:-

١- کۆمەڵە هەمیشەیی‌یەکانی فشار (جماعات الضغط الدائمة):-

وەك گروپە ئابوری‌یەکان ((کۆمپانیاکانی نەوت، گەورە بازرگانان بانکە گەورەکان، پیشەوەران، یاخود گروپە سیاسیەکان (وەك لۆبی زایۆنی) )).

٢- کۆمەڵە کاتیەکانی فشار ((جماعات الضغط المؤقتة)):-

ئەم گروپانە بە تایبەت پەیوەستن بەو ڕێکخراوانەوە کە تەنها هەندێ جار هەوڵ دەدەن کاربکەنە سەر بڕاڤی سیاسی دەرەکی داڕشتنی بڕیار بە شێوەیەکی پۆزەتیڤانە یان نێگەتیڤانە. ئەمەش لەژێر ڕۆشنایی ئاستی نزیکی جموجۆڵی بڕیار بەدەستان یان دوریان لە ئەولەویاتی سیاسی کارەکانیانەوە وەك ((کۆمەڵە ئاینی‌یەکان، ڕەگەزیەکان، زمانەوانیەکان، ڕێکخراوەکانی قوتابیان، ژنان، پەیمانگاو ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەی ستراتیجی ... هتد)).[٤٦]

دەتوانرێت بووترێت گروپەکانی فشار لە وڵاتە سۆشیالیستی و ڕۆژئاوایی و تازە پێگەیشتووەکانیشدا بوونیان هەیە، بێگومان پەیوەندیەکی توندو تۆڵ هەیە لە نێوان گروپەکانی فشارو پێکهاتەی ڕای گشتی‌دا، ئەمەو ڕای گشتی لەلایەن گروپەکانی فشار بە گرنگترین ئەو گروپە مەرجەعیانە

دەژمێررێت کە کار لە پێکهاتەی ڕای گشتی دەکەن، لەبەر ئەوەی حکومەتەکان بۆ مانەوەیان پشت بەڕای گشتی دەبەستن، شتێکی ئاسایی‌یە گروپەکانی فشار بایەخێکی زۆر بدەن بە ئامادە باشی بۆ سازدانی ڕای گشتی‌و ڕێنوێنی کردنی لە زۆر کاتدا بۆ مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانیان[٤٧]. گروپەکانی فشار سڵ ناکەنەوە لە بەکارهێنانی خراپترین شێوازو کار بە مەبەستی بەدیهێنانی بەرژەوەندی‌و ئامانجەکانیان، ئەمەش پاڵیان پێوە دەنێت هەندێ جار شێوازی ناڕەواو دوور لە ڕەوشت بەرزی بەکاربهێنن، ئەمەو هەندێك جار ئەم گروپانە دەبنە هۆکارێك بۆ سەرهەڵدانی نائارامی حکومی‌و ناجێگیری لە سیستمی سیاسی‌دا، بەهۆی پەنا بردنیانەوە بۆ ڕوخاندنی حکومەتەکان کاتێك دەگەنە ئەو بڕوایەی کە ئەم حکومەتانە بەجۆرێك لە جۆرەکان لە خزمەتی بەرژەوەندیەکانیاندا نابن.[٤٨]

لێرەدا بە پێویستی دەزانین ئاماژە بۆ گرنگترین ئەو هۆکارو ئامرازانە بکەین کە گروپەکانی فشار، بە تایبەتی لۆبی زایۆنی، بۆ کاریگەری خستنە سەر بازنەو ناوەندەکانی داڕشتنی بڕیاری سیاسی بەکاری دەهێنن کە بریتین لەمانەی خوارەوە:-

١- **ئامرازی کارتێکردنی ڕاستەوخۆ:-** ئەم ئامرازانە بریتین لە پرۆژەی پەیوەندی کردن بە بەرپرسان‌و پشتگیری مادی‌و کۆکردنەوەو دابەشکردنی زانیاری، سەرنج ڕاکێشانی دەستە دادوەریەکان، هەروەها پەیوەندی کردن بە دەسەڵاتی جێبەجێ کردنەوە.

٢- **ئامرازی کارتێکردنی ناڕاستەوخۆ:-** وەك میکانیزمەکانی ڕێکخستن، بەکارهێنانی ڕای گشتی، بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵەکانی تردا، کاریگەرێتی لە پرۆسەکانی هەڵبژاردندا هەروەها گاڵتەجاڕی.[٤٩]

دواجار بە گرنگی دەزانین ئاماژە بۆ هەندێك لە جۆرەکانی هاوپەیمانێتی بکەین کە لەنێوان حیزبەکان‌و گروپەکانی فشاردا دروست دەبێت لە چەند هەڵوێستێکی دیاریکراوداو لەمەڕ هەندێك کێشەدا، ئەم هاوپەیمانێتی‌یە زۆرجار دەستەبەرکردنی یەکێك لە سەرچاوەکانی ئەکتیڤ بوونی گروپەکانی فشار بۆ کارکردنە سەر داڕشتنی سیاسەتە گشتیەکان دێنێتە دی.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم باسەدا بۆمان دەرکەوت کە گروپەکانی فشار ڕێژەی کاریگەرێتی‌یان بەپێی جیاوازی سروشت‌و ئامانج‌و تواناکانیان بۆ کارکردنە

سەر دروستكەرانی بڕیار لە سیستمی سیاسیدا جیاوازە، ئەم جیاوازیەش لە سیستمێكەوە بۆ سیستمێكی دی دەگۆڕێت.

**پێنجەم:- جۆری سیستمی سیاسی**

سیستمی سیاسی بریتی‌یە لە شێوازگەلێكی تێكهەڵكێشراو و پێكەوە گرێ‌دراو پەیوەند دارە بە پرۆسەی دروستكردنی بڕیارەوە، كە ڕەنگدانەوەی ئەوئامانج و جیاوازی‌و ململانێ‌یانەی كۆمەڵگایە كە دەرهاویشتەی بنەما ئایدولوجیەكانن كە سیفەتی ڕەوایی‌یان بەهێزە سیاسیەكان بەخشیوە تا بونەتە دەسەڵاتێكی قبوڵكراو لە كۆمەڵگەی سیاسیدا، كە خۆی لە دام‌و دەزگا سیاسیەكاندا دەبینێتەوە.[٥٠]

لەمیانەی ئەم پێناسە گشتگیرەی سیستمی سیاسیەوە جەخت دەخەینە سەر شێوازی بەڕێوەبردنی دەسەڵات‌و چۆنێتی پێكهێنان‌و پێكهاتنی پەیكەری پرۆسەی دروستكردنی بڕیار.

لە لایەكەوە دەبینین لە هەندێك وڵاتدا تاكە كەسێك باڵا دەستە بەسەر دروستكردنی بڕیاری سیاسی وڵاتەكەیدا (وەك ئەڵمانیای نازی)، لە لایەكی ترەوە دەبینین چەند كەسانێكی كەم لە هەندێك وڵاتدا بڕیاری ترەوە دەبینین چەند كەسانێكی كەم لە هەندێك وڵاتدا بڕیاری سیاسی وڵاتیان لە دەستدایە (وەك ڕژێمی قەوارەی زایۆنی)، لە هەندێ وڵاتی تریشدا گەل باڵا دەستە لە داڕشتنی سیاسەتی دەرەكی وڵاتەكەیدا (وەك بەریتانیا).[٥١]

بەم شێوەیە بۆمان دەركەوت كە وڵاتان لە داڕشتنی سیاسەتی دەرەكیاندا جیاوازن. دكتور ((لوید جنسن)) لەمەڕ هەڵسەنگاندنی سیستمی دیموكراسی‌و تۆتالیتاری‌دا، وە لەمەڕ وەڵامی پرسیاری: ئایا كامیان باشترن لە دروستكردنی سیاسەتی دەرەكیدا؟ دەڵێت: گەر پێوەری لێهاتوویی‌و كارایی وەربگرین ئەوا چەند هۆكارێك هەن وا دەكەن فەزڵی سیستمی تۆتالیتاری بدرێت بەسەر سیستمی دیموكراسیدا، چونكە ئەم سیستمە (تۆتالیتاری) خێراترە لە بڕیارداندا وەرگرتنی بەدەمەوە چوونی بڕیارەكە دەكات لە نێوخۆی وڵاتدا، هەروەها دەگونجێت زیاتر یەكدەنگی‌و یەكڕیزی بەدی بكرێت لە سیستمی تۆتالیتاریدا لەسەر سیاسەتی دەرەكی، بەڵام ئەم سیستمە بەردەوام ناتوانێت ئەم خاڵە پۆزەتیڤانە بۆ خۆی بەرجەستە بكات، ئەمەو زۆر كەمتر كارا دەبێت لە سیستمی دیموكراسی لە بواری پێشخستنی

داهێنان له سیاسه‌تی ده‌ره‌کیدا، ئه‌مه‌ش به‌هۆی ترسانی یاریده‌ده‌رانی بڕیار به‌ده‌ستان له ڕه‌خنه گرتن له سیاسه‌تی ده‌ره‌کی په‌یڕه‌وکراویان.[٥٢] ده‌کرێت بڵێین که سیستمی دکتاتوری زۆر کات له ڕووبه‌ڕووبونه‌وه‌و بڕیارداندا، خێراترن به‌به‌راورد له‌گه‌ڵ سیستمه‌ی دیموکراسییه‌کاندا، ئه‌مه‌ش ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی بڕیاره‌کان له سیستمه‌که‌دا ڕه‌نگ دانه‌وه دیدو بۆچوون و به‌رژه‌وه‌ندی‌و ئامانجه‌کانی جه‌ماوه‌رنین، به‌ڵکو گوزارشت ده‌که‌ن له دیدو بۆچون‌و که‌سایه‌تی سه‌رۆك‌و ئه‌وانه‌ی له‌ناوه‌ندی ده‌سه‌ڵاتدان.

لێره‌دا پرسیارێك دێته ئاراوه: ئایا خێرایی‌و کارایی له بڕیارداندا به‌سه بۆ به‌دیهێنانی به‌رژه‌وه‌ندی‌یه‌کانی گه‌ل‌و ئامانجه‌کانی؟ یان سیستمی سیاسی ده‌بێت خاوه‌نی که‌ره‌سته‌و ماده‌ی سیاسی بێت که خۆی له‌مانه‌دا ده‌بینێته‌وه:-

١- ئه‌و چالاکیه کۆمه‌ڵایه‌تیانه‌ی که سیستمی سیاسی هه‌یه‌تی.
٢- ئاست‌و پله‌ی به‌دام‌و ده‌زگا کردنی سیستمی سیاسی.
٣- ئاست‌و ڕێژه‌ی (پله‌ی) پشتگیری جه‌ماوه‌ر.

ئه‌و سیستمه‌ی که له‌م که‌ره‌ستانه‌دا هه‌ژار بێت یان توانای زاڵ بوون به‌سه‌ریانداو توانای ده‌سته‌به‌رکردنیانی که‌م بێت، له پێگه‌یه‌کی لاوازدا ده‌بێت به‌رامبه‌ر به گۆڕانکاری‌یه‌کانی ژینگه‌ی ده‌ره‌کی، ئه‌مه‌ش کارده‌کاته سه‌ر سیاسه‌تی به‌شێوه‌یه‌ك ده‌بێته پاشکۆو له‌بواری سیاسه‌تی ده‌ره‌کیدا ئازادو سه‌ربه‌خۆ نابێت.[٥٣] له لایه‌کی تره‌وه سیستمه سیاسیه‌کان له ڕووی چۆنێتی دروستکردنی بڕیارو ئاستی بیرۆکراتیزه بونیان له ڕووی به‌ڕێوه‌بردنه‌وه جیاوازه که خۆی له‌مانه‌دا ده‌بینێته‌وه:-

١- کۆی بنه‌ما یاسایی‌یه نوسراوه‌کان، ڕێ‌و شوێنی به‌ڕێوه‌بردن (ئیجرائاته ئیداریه‌کان).
٢- زنجیره‌ی فه‌رماندان‌و پله به‌ندی ده‌سه‌ڵاته‌کان.
٣- پشت به‌ستن به بنه‌مای تایبه‌تمه‌ندی وه‌زیفی له مامه‌ڵه کردن له‌گه‌ڵ فه‌رمانبه‌راندا.[٥٤]

دواجار دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی بەپێی سیستمە سیاسیەکان دەگۆڕێت، چونکە هەر سیستمێك چەند بەرژەوەندیو ئامانجگەلێکی خۆی هەیەو هەوڵی بەدیهێنانیان دەدات، بەڵام بە چەند ڕێگەو میکانیزمێکی جیاواز، دەوڵەتانیش لە ڕووی بوون یان نەبوونی کەرەستەی سیاسی (الموارد السياسية)ی بەردەستو جۆری بەکارهێنانیشیانەوە جیاوازن، هەروەك چۆن لەڕووی ئاستی بیروکراتیزە بوونی سیستمەکەو ڕێژەی کارابوونو بەدەمەوە چوونی داواکاریەکانی گەلەکەیو گونجاویی لەگەڵ ژینگەی نێودەوڵەتیدا بەو ئاراستەیەدا کە بەرژەوەندیەکانی گەلەکەی بهێنێتە دی.

## شەشەم:- زانکۆ و ناوەندەکانی لێکۆڵینەوە

زانکۆو ناوەندەکانی لێکۆڵینەوە لەزۆرێك وولاتانی جیهاندا، بە تایبەت لە وولاتە پێشکەوتووەکان، لە چەندین مەیدانی جیاجیادا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕنو بەشداریەکی کارا دەکەن لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکیدا.

ئەم ڕاستیە بەڕوونی دەردەکەوێت دوای ئەو پێشکەوتنە بەرچاووزۆرەی جیهانی ئەمڕۆ لەبوارە جیاجیاکانی تەکنەلۆجیا، پەیوەندیکردن، زانستو ...هتد دا بەخۆیەوە بینیوە.

ڕاوێژکاری سەرۆکی ئەمریکی پێشووتر ((ریگان)) بۆ کاروباری زانستیو تەکنەلۆجی ((جۆرج کەی وۆرث)) دەڵێت:- پێویستە جۆرێکی نوێ لە هاوبەشی کردن لە نێوان حکومەتو پیشەسازیو کۆمەڵگای ئەکادیمیدا دروست بکرێت، لە پێناوی ئەوەدا حکومەت ببێتە سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ یارمەتی دانو پشتگیری کردنی لێکۆڵینەوەی بنچینەییو لێکۆڵینەوەی پراکتیکیو پێشکەوتنی ئەزموونی، لەو بوارانەدا کە حکومەت بە بەکاربەری سەرەکی دادەنرێت تێیدا، بەتایبەتی لە بواری بەرگریو بۆشایی ئاسماندا.[٥٥]

لەم سۆنگەیەوە زۆرێك لە دەوڵەتان گرنگیان بە ناوەندەكانی لێكۆڵینەوەو زانكۆكان داوە، بۆ نمونە: لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا زاناو شارەزاو پسپۆڕەكانیان لە بوارە جیاجیاكانی زانستو مەعریفە، بە چەندین شێواز بەشداری دەكەن لە داڕشتنو گەڵاڵەكردنی سیاسەتی نێوخۆییو دەرەكی ئەمریكادا زانكۆكان بە بنكەو مۆڵگە سەرەكی چالاكی ئەم توێژە دادەنرێن، بۆ نموونە: لە زۆربەی زانكۆ ئەمریكیەكاندا لەپاڵ دەستە پیشەییەكاندا چەندین بەشی پسپۆڕیو ناوەندی لێكۆڵینەوە هەیە كە حكومەت یان كۆنگریس یاخود ناوەندەكانی ڕاگەیاندن، ناوەندە حیزبی و ئابوریەكان پشتی پێ دەبەستن بۆ بەرهەم هێنانی لێكۆڵینەوەی مەیدانیو چەند دیدو ستراتیجیەك كە ببێتە زەمینە سازیەك بۆ دروستكردنی چەند ئەگەرو بژاردەیەكی دیاری كراو لەلایەن بڕیار بەدەستەوە.[٥٦]

بەم شێوەیە دەبینین كە ئەم ناوەندانە بە ئەڵقەیەكی بنچینەیی دروستكردنی بڕیاری سیاسی دادەنرێت لە زۆرێك لە وڵاتاندا، چونكە دامەزراوە سیاسیەكان پشت بەم ناوەندانە دەبەستن بە تایبەت لە بواری سیاسەتی دەرەكیو هەواڵگیریو بەرگریو كێشە ستراتیجیەكانیشدا، ئەمەش بەهۆی شارەزاو پسپۆڕانی زانستیو هونەری دەبێت هەریەكەیان لە بواری خۆیاندا، كاریگەرێتی زانكۆو ناوەندەكانی لێكۆڵینەوەش لە وڵاتێكەوە بۆ یەكێكی دی دەگۆڕێت، ئەمەش بەستراوە بە ئاستی گرنگی دانی ئەو وڵاتە بەو ناوەندانەو ئاستی پشت پێ بەستنیان، هەروەها دەگەڕێتەوە بۆ ڕێژەو جۆریان، واتە چەندایەتیو چۆنایەتی ئەم ناوەندانەو تەرخان كردنی بڕی كەرەستەو توانای ماددی بۆیان، هەموو ئەمانەش پەیوەندیان بە جۆری سروشتی سیستمی سیاسیو چۆنێتی عەقڵیەتی كاربەدەستانەوە هەیە.

# باسی سێهەم

## فاکتەری سەرکردە

لەم باسەدا دەمانەوێت بەشێوەیەکی گشتی باس لەو فاکتەرانە بکەین کە پەیوەندیان بە کەسایەتی بڕیار بەدەست خۆیەوە هەیەو کار لە جۆرو ئاڕاستەی بڕیاری سیاسی دەرەکی دەکەن.

لە ڕاستیدا ڕۆڵی سەرکردەی سیاسیو گرنگیەکەی لە سیاسەتی دەرەکیدا لەوەدا دەردەکەوێت کە ڕەفتاری دەوڵەتانو یەکە نێو دەوڵەتیەکان بریتییە لە ڕەفتاری ئەو کەسانەی کە بەناوی ئەوانەوە کاردەکەن (واتە بڕیار بەدەستان)، بڕیار بەدەستانیش تواناو گۆڕانکاریە نێوخۆییو دەرەکیەکانی وڵاتەکانیان بەپێی بیروباوەڕو دیدو بۆچوونو ئاڕاستەکانیانو تێگەیشتنیان بۆ گۆڕانکاریو هەلومەرجەکان هەڵدەسەنگێنن، واتە ئەمانە بەپێی ئاستی تێگەیشتنو پێزانینیان بۆ پێگەی وڵاتەکەیان و ڕێژەی قورساییو ڕۆڵو کاریگەریتی وڵاتەکەیان لە ژینگەی نێودەوڵەتیدا دەبێت.

مەبەست لەو فاکتەرانەی کە پەیوەندیان بەسەرکردەوە هەیەو بریتین لە:-

**١-باری دەروونی بڕیار بەدەست: واتە کۆی بیرو باوەڕو تێگەیشتنو تایبەتمەندییەکانی بڕیار بەدەست کە بەپێی دیدو بۆچوونە خۆیەکیەکانی گۆڕانکاریە بابەتیەکان هەڵدەسەنگێنێت، نەك بەپێی حەقیقەتی ڕووداوەکان وەك خۆی.**

**٢-سروشتی سەرکردە:- ئەمەش بەپێی گۆڕانی شێوازو میکانیزمی دەسەڵات دەگۆڕێت، واتە سەرکردە بە چ کەناڵو ڕێگەیەکدا گەیشتووەتە کورسی دەسەڵات، ئەمەش کاریگەریتی جیاوازی دەبێت لەپرۆسەی بڕیارداندا.**

**٣-تایبەتمەندیە کۆمەڵایەتیەکانو سیفەتە میزاجیەکانو سیستمی بیروباوەڕو بۆچونەکانی بڕیار بەدەست.[٥٧]**

((سەرکردە زۆرجار ناتوانێت بەرپرسیارێتی خۆی بداتە دەست کەسێکی تر، چونکە پشکی هەرەزۆری کاری سەرۆك بریتی‌یە لە بڕیار دان*))(٥٨) بۆیە پێویستە بزانین فاکتەری سەرکردە لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاردا وەك فاکتەرێکی سەرەکی یان فاکتەرێکی سەربەخۆ لە پرۆسەکەدا ڕۆڵ دەگێڕێت.

لەسەر ئاستی تیۆری دەتوانرێت بووترێت سەرکردە بەپێی دیاریکردن‌و دەست نیشانکردنی خۆی بۆ هەڵوێستەکان کار دەکات، ئەم دیاریکردنەشی لەمیانەی فاکتەر گەلێکەوە سەرچاوە دەگرێت کە گرنگترینیان ئەمانەن:-

١- فاکتەرە کەسیەکان (واتە خۆیان لە دیدی خۆیاندا).

٢- فاکتەرەکانی ڕێکخستن (شێوازی دەرکردنی بڕیار).

٣- ئەو فاکتەرانەی پەیوەندیان بە هەڵوێستەوە هەیە.(٥٩)

هۆڵستی بڕوای وایە کە شێوەو انطباعات (images)و ئاراستەو (attitudes) بەهاکان‌و (values) بیروباوەڕەکان‌و (beliefs) ڕێبازو ڕێچکەو ئایدۆلۆجیەکان، هەموویان ڕۆڵی گرنگ دەبینن لە دیاریکردن‌و ناساندنی هەڵوێستی سیاسی دەرەکی‌و بینینی ئەو هەڵوێستەش لەلایەن بڕیار بەدەستەوە.(٦٠)

لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە خاوەن بڕیار مل کەچی فشارو فاکتەرگەلێك دەبێت کە دەتوانرێت بکرێن بەسێ بەشەوە:-

١- فاکتەرە مرۆییەکان.

٢- فاکتەرەکانی ڕێکخستن (العوامل التنظيمية).

٣- فاکتەرە ژینگەیی‌یەکان (العوامل البيئية).(٦١)

هەر یەکێك لەم فاکتەرانەش تەحەککوم دەکەن بەسەر بڕیار بەدەستداو ڕۆڵیان هەیە لە گۆڕینی ئاڕستەو جۆری بڕیارەکان بەپێی جیاوازی هەل‌و مەرج‌و بارودۆخەکان.

لە ڕاستیدا ناسینی ئەو فاکتەرانەی کار لە پێکهاتەی کەسایەتی بڕیار بەدەست دەکەن یارمەتیمان دەدات بۆ ناسین‌و زانینی ئەگەری جۆری ئەو ڕەفتارانەی کە دەکرێت بڕیار بەدەست بیانکاتە بنچینەی مامەڵەکردن لەمەڕ ئەو کێشەو هەڵوێستانەدا کە دێنە پێش‌و سەرهەڵدەدەن.

---

* لە ووتەکانی یەکێك لە سەرۆکەکانی ئەمەریکا (هاری ترومان) لە ١٥ کانون دووەمی ساڵی ١٩٥٣ دا.

پێکهاتەی کەسایەتی بڕیار بەدەستو فاکتەرە ئایدۆلۆجیەکانو بەهار دابو نەریتەکانو پێکهاتەی دەرونی مرۆڤو کاریگەریان لەسەر گەڵاڵە بوونی ئەم پێکهاتەیە، هەموو ئەم فاکتەرانە سەر دەکێشن بۆ دیاریکردنی پاڵنەرو ئاراستەکانی مرۆڤ.[٦٢] ئەمە لەگەڵ جیاوازی پلەی کاریگەریتی هەریەکەیان لەسەر بڕیار بەدەست، بۆ نموونە: بێبەش بوونی سەرۆکی ئەمریکی (ولسن) لە سۆزی باوکایەتی وای کردبوو زیاتر لە کاروبارەکانیدا پەنا بۆ هێز بەرێت. هەروەها هەست کردنی سەرۆکی میسری جەمال عەبدولناسر هەر لەسەرەتای منداڵییەوە بە نائارامی، بەهۆی کۆچی دوایی باوکیەوە، وای کردبوو زیاتر بە گومانو هەستیار بێت بەرامبەر بە کەسانی ترو زیاتر جەخت لەسەر شکۆداری بکاتەوە.[٦٣]

ئەدۆلف هیتلەریش لە کتێبەکەیدا (کفاحی) کاتێك باسی تەمەنی منداڵی خۆی دەکات دەڵێت: ((من هەر وەك هاندەر و سەرکردە خولقێنراوم)).[٦٤]

هەموو ئەمانە جەخت لەسەر ڕۆڵی سیفەتەکان (تایبەتمەندییەکان) دەکاتەوە لە پێکهاتەی تاکدا بەو ئاڕاستەیەی کە بەرەو پەیڕەو کردنی ئەو ڕەفتارانەی ببات کە ڕەنگ دانەوەی سروشتێتی.

ویستی خۆیەتیو ئاستی ئامادەیی خۆیەتی خاوەن بڕیار بۆ دەرکردنی بڕیارێکی دیاری کراو کار دەکاتە سەر ڕەفتاری دروستکەری بڕیار بەرەو دوو ئاڕاستە:-

١-ویستی بڕیار بەدەست ویستێکی کامڵو پتەوەو فاکتەرە بابەتیەکانی لەبەر چاو گرتووە، بە شێوەیەك کە سەر بکێشێت بۆ ئامادەبوونی ویستێکی پۆزەتیڤانە بۆ دەرکردنی بڕیارێکی سەرکەوتوو.

٢-ویستی بڕیار بەدەست ویستێکی ناکامڵ دەبێتو لا دەدات بەپێی سۆزو ئارەزووەکانیو تێڕوانینێکی زانستی نابێت بۆ ڕەهەندە حەقیقیەکانی هەڵوێست و ڕووداوەکان، ئەمەش زۆرجار دەبێتە مایەی نوچدانو هەرەس نەك هەر لە هەڵبژاردنی باشترین جێگرەوەو دەرکردنی بڕیارێکی دروستدا، بەڵکو لە دیاریکردنی کاتی جێبەجێکردنیشیدا.[٦٥]

لێرەوە دەتوانرێت بوترێت دەگونجێت بڕیاربەدەستان تایبەتمەندییان هەبێت کەکار دەکاتە سەر ڕەفتاری سیاسەتی دەرەکیو هەڵبژاردنەکانیشی بۆ جێگرەوەکان، نەك هەر ئەمە بەڵکو هەندێك جار کەسانێکی وا دەسەڵات

دەگرنە دەست کە کەسایەتیەکی شازن و دەسەو سانن بەرامبەر بەسۆزو حەزو ئارەزووەکانیان، ئەمەش دەبێتە مایەی کێشەی سەرهەڵدانی چەندین کێشەو قەیران و تێکدانی ئارامی سیستمی نێو دەوڵەتی.(٦٦)

هەرچەندە دیدو بۆچوون و تێگەیشتنی دروستکەری بڕیار بۆ ژینگە بابەتیە ناوخۆیی و دەرەکیەکانی تێڕوانینێکی ڕاست و دروست بێت، ئەوا بڕیارەکەشی بە هەمان شێوە ڕاست و دروست دەبێت، وە بە پێچەوانەوە. بە دەستەواژەیەکی تر، ئاستی سەرکەوتن یان نوچدان و هەرەسی سیاسەتی دەرەکی لەسەر ئاستی دوری و نزیکی نێوان فاکتەرە بابەتیەکان و فاکتەرە دەرونیەکان دەوەستێت.

هەروەك (کیسنجر) دەڵێت: سروشتی سەرکردە کار لە سیاسەتی دەرەکی دەکات، چونکە بڕیارەکان لە دواجاردا لە لایەن تاکەکانەوە دەدرێن، تاکەکانیش دەبێت لە نێوان جێگرەوەکاندا یەك جێگرەوە هەڵبژێرن و بیکەن بە بڕیار، و ئەم هەڵبژاردنەش بەپێی سروشتی سەرکردە بڕیار بەدەستەکان دەگۆڕێت.

ئەوەی جەخت لەسەر ئەمە دەکاتەوە وتەی سەرۆکی پێشوتری ئەمریکی (ئەندرۆجاکسۆن)* ە کە دەڵێت:-

((خۆم ڕاهێناوە لەسەر قبوڵکردنی دیدو بۆچوونی کەسانی تر بەڕێزەوە، بەڵام لە سەرەتاو کۆتایشدا هەر خۆم بەر پرسم لە دەرکردنیبڕیار))(٦٧)

بێگومان بڕیاریش کاریگەریتی کەسایەتی سەرکردەی لەسەرە، بۆ نموونە پێکهاتەی کەسایەتی (جۆرج بۆشی باوك) وەك کەسێکی ئابوری ناس لە بواری نەوتدا کاریگەری هەبوو لە هەڵسەنگاندنیدا بۆ هەڵوێستەکان لە قەیرانی کەنداودا، وە ئەو لەوە دەترسا صەددام بتوانێت سعودیە داگیر بکات.(٦٨)

لێرەوە ئاستی پەیوەندی نێوان کەسایەتی و هەڵوێست نواندن و پەیوەندیان بە فشارەکانەوە بەڕونی دەردەکەوێت.

بەرگەگرتنی فشارەکان دەرەنجامی کەسایەتی و هەڵوێستەکانە، واتە: تا چەندێك کەسایەتی بڕیار بەدەست و هەڵوێست و هەلومەرجەکان هەماهەنگ و

---

* ئەندرو جاکسن لە ساڵی ١٩٦٣ پۆستی سەرۆکایەتی (USA)ی گرتۆتە دەست.

نزیك بن لە یەكەوەو گونجاو بن، ئەوەندە رووبەڕوو بوونەوەی فشارەكان بۆ بەرگە گرتنیان زیاد دەكات.

واتە: فشارەكان = هێما (دالة) (كەسایەتی × هەڵوێست)[٦٩]

ئەم هاوكێشەیە ئاستی كاریگەری كەسایەتی بڕیار بەدەستمان بۆ ڕوون دەكاتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا بڕیار بەدەست ڕووبەڕووی زنجیرەیەك لە ڕیزبەندیو هەڵسەنگاندن دەبێتەوە لە نزمترین پلەكانی ئەم زنجیرەیەوە تا بەرزترینیان، هەروەها بڕیار بەدەست ڕەچاوی كۆمەڵێك یاساو بنەمای ئیجرائی دەكات، تا لە میانەیەوە بتوانێت چۆن ڕیز بەندیان بكات بەپێی گرنگیان، ئەمەو بڕیار بەدەست بایەخی تەواو بە هەموو فاكتەرە وەزیفیو دامەزراوەییو كەسایەتیو كۆمەڵایەتیو سیاسیەكان دەدات كە هەریەكەیان كاریگەری خۆی هەیە لە دروستكردنی بڕیاری دەسەڵاتداراندا.[٧٠]

لە دەرەنجامی ئەم باسەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە بڕیار بەدەست یەكێكە لەو فاكتەرە گرنگانەی كە كار دەكەنە سەر ئاراستەی ڕێرەوی سیاسەتی دەرەكی، لەبەر ئەوەی تێگەیشتنی بڕیار بەدەست بۆ هەڵوێستو بارودۆخەكان، وە جۆری بیرو باوەڕو تایبەتمەندیەكانیو سیفاتە خۆیەتییەكانیو توانای بۆچوونو هەڵسەنگاندنو هەڵێنجانو پێشبینی كردنی، هەموو ئەمانە كار دەكەنە سەر ئەو بڕیارەی كە دەری دەكات. ئەمەش بەسەر هەموو وڵاتاندا جێبەجێ دەبێت، بەڵام بەڕێژەی جیاواز، ئەمەو هەموو لێكۆڵینەوەكان جەخت لەسەر ڕۆڵی سەرەكیو میحوەری سەرۆكی دەوڵەت دەكەنەوە لە پرۆسەی دروستكردنی بڕیاری سیاسی گرنگداو، سنورداری ناوەندی دروستكردنی بڕیارو دامو دەزگای دەوڵەت لە بەشداری كردن لەم پرۆسەیەدا لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەكاندا دوپات دەكەنەوە. بەڵام لە وڵاتە پێشكەوتووەكاندا دروستكەری بڕیار هەرچەندە ڕۆڵی خۆی دەبینێت لەم پرۆسەیەدا، بەڵام وەك وڵاتە تازە پێگەیشتووەكان دەرناكەوێت، ئەمەش بەهۆی بوونی چەندین دامو دەزگاو ڕای گشتی كە بەشداری دەكەنو كاریگەریان هەیە لەسەر پرۆسەی بڕیاردان، ئەمانەش هەموو پلەبەندی دەكرێن بەپێی ئاستی هۆشیاری جەماوەرو بوونی ئازادی ڕادەربڕینو ئاستی بوونی دامو دەزگای بەشدار لە پرۆسەی بڕیارداندا.

# پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

(١) هاني الياس خضر الحديثى، في عملية صنع القرار السياسي الخارجي،دار الرشيد للنشر، بغداد ١٩٨٢،ص١٣-١٤.

(٢) شريف جويد العلوان، السياسة الخارجية الأميركية وازمة الشرق الأوسط ١٩٦٧-١٩٧٣، مطبعة المعارف، بغداد، الطبعة الأولى، ١٩٧٨، ص١٦.

(٣) د. ضرغام عبيدالله الدباغ، قضايا الأمن القومي والقرار السياسي، مطبعة الانتصار بغداد، الطبعة الأولى ١٩٨٦، ص٩٢.

(٤) د. مازن اسماعيل الرمضاني، السياسية الخارجية، دراسة نظرية، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، بغداد ١٩٩١، ص١٦٥.

(٥) د. اسماعيل صبري مقلد، نظريات السياسية الدولية، دراسة تحليلية مقارنة، منشورات دراسات السلاسل الكويت، الطبعة الثانية ١٩٨٧، ص١٩٢.

(٦) زايد عبيدالله مصباح، مصدر سبق ذكره، ص٨٨.

(٧) د. ضرغام عبدالله، مصدر سبق ذكره، ص٩٢-٩٤.

(٨) نفس المصدر، ص٩٤-٩٥، وانظر أيضا (مستەفا ابراهيم، ئەو فاکتەرانەی کار دەکەنە سەر پرۆسەی دارشتنی بریاری سیاسی، گۆڤاری سیاسەتی دەولی، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی ژمارە ٤، ساڵی دووەم- کانونی دووەمی ١٩٩٤، ص٦٣).

(٩) هاني الياس خضر الحديثي، مصدر سبق ذكره، ص١٩.

(١٠) د. احمد شوقي الحفني، المؤسسة العسكرية في دول العالم الثالث، مجلة المنار، العدد ٦٤، السنة السادسة العدد ١٦٤ ابريل، ١٩٩٠، ص٤٢.

(١١) عبدالحميد محمود الخطاب، دور المؤسسة العسكرية في القرار السياسي الإسرائيلي، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، الطبعة الأولى ١٩٨٩، ص٤٩.

(١٢) د. خليل الشقاقي بنية النظام السياسي وصنع القرارات في إسرائيل، المجلة العربية للعلوم السياسية، الجمعية العربية للعلوم السياسية، بغداد، العدد الثاني- السنة الثالثة ١٩٨٨، ص٢٢٧-٢٢٨.

(١) طلال يونس الجليلي، مجلس الأمن القومي التركي والقرار السياسي، مجلة آفاق عربية، العدد الأول،(كانون الثاني — شباط ١٩٩٩) ص٣٥.

(١) د. جلال عبدالله معوض، صناعة القرار التركي والعلاقات العربية — التركية، مركز دراسات العربية- بيروت، الطبعة الأولى ١٩٩٨، ص٢٨٢.

(١) راجع زايد عبيدالله مصباح، مصدر سبق ذكره، ص٨٩-٩٠.

(١٦) ولاء عبدالباقي الرويشدي، السياسة الخارجية الهندية، رسالة ماجستير/ المعهد العالي للدراسات القومية والاشتراكية، جامعة المستنصرية بغداد ١٩٨٣، ص٤.

(١٧) د. صباح محمد محمود، وآخرون، الجغرافية السياسية، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، الجمهورية العراقية، بدون سنة ومكان الطبع، ص١٤٩.

(١٨) د. فاضل زكي محمد، السياسة الخارجية وأبعادها في السياسة الدولية، مطبعة شفيق، بغداد، الطبعة الأولى ١٩٧٥، ص١٠٠-١٠١.

(١٩) هاني الياس خضر الحديثي، مصدر سبق ذكره، ص٢٠.

(٢٠) د. وليد حمدي الاعظمي، العلاقات السعودية الأميركية وأمن الخليج في وثائق غير منشورة (١٩٦٥-١٩٩١) دار الحكمة، الطبعة الأولى، ١٩٩٢، ص٢٢-٢٣.

(٢١) ولاء عبدالباقي الرويشدى، مصدر سبق ذكره، ص٧-٨.

(٢٢) د. عبدالرزاق عباس حسين، الجغرافية السياسية مع التركيز على المفاهيم الجيوبولوتيكية، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٧٦، ص٣٤٠.

(٢٣) هاني الياس خضر الحديثي، مصدر سبق ذكره، ص٢٢-٢٣.

(٢٤) د. محمد السيد سليم، تحليل السياسة الخارجية، دار الجيل، بيروت، القاهرة، تونس، الطبعة الثانية، ٢٠٠١، ص٢٤١.

(٢٥) هادي العلوى، قاموس الدولة والاقتصاد، دار الكنوز الأدبية، بيروت، الطبعة الأولى ١٩٩٧، ص٢٧.

(٢٦) د. روبرت ود. كانتور، السياسة الدولية المعاصرة، ترجمة د. احمد ظاهر، مركز الكتب الأردنى، ١٩٨٩، ص٣٩٧-٤٠٠.

(٢٧) د. حميدة سميسم، نظرية الراي العام مدخل، وزارة الثقافة والإعلام، بغداد ١٩٩٢، ص٤٩.

(٢٨) هاني الياس الحديثي، مصدر سبق ذكره، ص٢٥.

(٢٩) د. محمد سيد سليم، مصدر سبق ذكره، ص٢٤١-٢٤٩.

(٣٠) د. اسماعيل صبري مقلد، نظريات السياسة الدولية، دراسة تحليلية مقارنة، دراسات السلاسل الكويت، الطبعة الثانية ١٩٨٧، ص٢١٥.

(٣١) د. محمد السيد سليم، مصدر سبق ذكره، ص٢٤٩.

(٣٢) زايد عبيدالله مصباح، مصدر سبق ذكره، ص٩٦-٩٧.

(٣٣) كانبي محمد عولا، الديمقراطية والسياسة الخارجية، بحث البكالوريوس، جامعة صلاح الدين/كلية القانون والسياسة – قسم السياسة، اربيل، ١٩٩٧، ص٢٠.

(٣٤) اوستن رني، سياسة الحكم، ج١، ترجمة حسن على الذنون، المكتبة الأهلية، بغداد ١٩٦٤، ص٣١٧-٣١٨.

(٣٥) د. هالة ابوبكر سعودي، السياسة الاميركية تجاه الصراع العربي – الإسرائيلي ١٩٦٧-١٩٧٣، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، الطبعة الأولى ١٩٨٣، ص١١٣.

(٣٦) للمزيد راجع: د. عامر حسن فياض، انتباهات منهجية حول العلاقات مابين الرأي العام والاتصال، مجلة البحوث الإعلامية، العدد ١٩-٢٠، السنة السابعة ٢٠٠٠، ص٤٥.

(٣٧) منصف السليمي، مصدر سبق ذكره، ص٣٠.

(٣٨) هاني الياس خضر الحديثي مصدر سبق ذكره، ص٢٦٨

(٣٩) انظر للتفاصيل: د.مازن اسماعيل الرمضاني، السياسة الخارجية، مصدر سبق ذكره، ص٢١٤-٢١٥.

(٤٠) هاني الياس خضر، مصدر سبق ذكره، ص٣١.

(٤١) منصف السليمي، مصدر سبق ذكره، ص٢٣٤.

(٤٢) جلال عبدالله معوض، مصدر سبق ذكره، ص٢٨٨.

(٤٣) لمزيد من الاطلاع انظر: جان مينو، الجماعات الضاغطة، ترجمة يهيج شعبان، منشورات عويدات، بيروت، الطبعة الثانية، ١٩٨٠، ص١٢و ما بعدها. وانظر: د. مهدي جابر مهدي، محاضرات في نظريات النظم السياسية، القيت على طلبة الصف الثالث بقسم السياسة بكلية القانون والسياسة للعام الدراسي ١٩٩٨-١٩٩٩. وانظر ايضا: كمال المنوفي، اصول النظم السياسية المقارنة، شركة الربيعان- الكويت، الطبعة الأولى ١٩٨٧، ص١٦٨.

(٤٤) هاني الياس خضر الحديثي، مصدر سبق ذكره، ص٣٣.

(٤٥) مهدي جابر مهدي، التطورات السياسية في الشرق الأوسط، محاضرات القيت على طلبة المرحلة الرابعة في قسم السياسة في كلية القانون والسياسة بجامعة صلاح الدين، سنة ٢٠٠١-٢٠٠٢.

(٤٦) د. مازن اسماعيل الرمضاني، السياسة الخارجية دراسة نظرية، جامعة بغداد ١٩٩١، ص٢٢٢-٢٢٣.

(٤٧) د. احسان محمد الحسن، علم الاجتماع السياسي جامعة بغداد، مطابق جامعة الموصل، ١٩٨٤ ص١٨٩

(٤٨) صلاح أحمد محمد أمين الديمقراطية والجماعات الضاغطة، بحث البكالوريوس بجامعة صلاح الدين، كلية القانون والسياسة – قسم السياسة، اربيل ١٩٩٧، ص١٦.

(٤٩) ممدوح الزوبي، هل ستسقط اميركا كما سقط الاتحاد السوفيتي رؤية مستقبلية، مؤسسة الإيمان، بيروت، دار الرشيد، دمشق، الطبعة

الثانية١٩٩٧، ص٢٨-٣٥. وانظر ايضا: د. صادق الأسود، علم الاجتماع السياسي اسسة وابعاده، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، جامعة بغداد، ص٥٢٤ وما بعدها.

(٥٠) زايد عبيدالله مصباح، مصدر سبق ذكره، ص٩٨.

(٥١) د.فاضل زكي محمد، السياسية الخارجية وابعادها في السياسة الدولية، مطبعة شفيق، بغداد، الطبعة الأولى ١٩٧٥، ص٥٠.

(٥٢) د. لويد جنسن، تفسير الخارجية، ترجمة: محمد ابن احمد مفتي و د. محمد السيد السليم، مطابع جامعة الملك سعود، الرياض، الطبعة الأولى ١٩٨٩، ص١٧٦.

(٥٣) زايد عبيدالله مصباح، مصدر سبق ذكره، ص١٠١.

(٥٤) منصف السليمي، مصدر سبق ذكره، ص١٩٠.

(٥٥) نفس المصدر، ص٢٧١.

(٥٦) نفس المصدر و والمكان.

(٥٧) انظر: عارف محمد خلف البياتي، مصدر سبق ذكره، ص٩٤، وانظر: امين هويدى، كيسنجر وإدارة الصراع الدولي، دار الموقف العربي، مصر، الطبعة الثانية، ١٩٨٦، ص١٣٠.

(٥٨) د. روبرت و د. كانتور، مصدر سبق ذكره، ص٤١٦.

(٥٩) زايد عبيدالله مصباح، مصدر سبق ذكره، ص٢٠٠.

(٦٠) د. اسماعيل صبري مقلد، نظريات السياسة الدولية، مصدر سبق ذكره، ٢٠٠-٢١٠.

(٦١) د. السيد عليوة، مصدر سبق ذكره، ص١٥٥.

(٦٢) هاني الياس خضر الحديثي، مصدر سبق ذكره، ص٤٢.

(٦٣) د. مازن اسماعيل الرمضاني، السياسة الخارجية، مصدر سبق ذكره، ص٢٦٩.

(٦٤) ادولف هتلر، كفاحي، ترجمة: يونس الحاج، مطبعة الراية، بغداد، دار صادر، بيروت ١٩٩٠، ص٩.

(٦٥) هاني الياس خضر الحديثي، مصدر سبق ذكره، ص٤٦.

(٦٦) د. لويد جنسن، مصدر سبق ذكره، ص٣٠.

(٦٧) امين هويدي، مصدر سبق ذكره، ص١٣١، وص١٤٣.

(٦٨) منصف السليمي، مصدر سبق ذكره، ص٢٥٤.

(٦٩) سعد خضر خلف العبيدي، مصدر سبق ذكره، ص٥٤.

(٧٠) د. حسن صعب، علم السياسة، دار العلم للملايين، بيروت، الطبعة الخامسة ١٩٧٧، ص٢٠٠.

# بەشی دووەم

## ئەو فاکتەرە دەرەکیانەی کار لەپرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی دەکەن

لە بەشی یەکەمی باسەکەماندا دیارترین فاکتەرە ناوخۆیی‌یەکانمان تاوو تویٚ کرد، لەم بەشەدا تیشك دەخەینە سەر گرنگترین ئەو فاکتەرە دەرەکیانەی کە ڕۆڵی کاریگەریان هەیە لەسەر بڕیاری سیاسی دەرەکی، ئەو فاکتەرانەی کە کاریگەرییان لەسەر پرۆسەی دروستکردنی بڕیار هەیە، کە زۆر جار ئەگەرەکانی دروستکەری بڕیار لەمەڕ کێشەو قەیرانە ئاڵۆزەکان کەم دەکەنەوە، ئەمانەش ((کۆمەڵێك فاکتەرو کۆتن کە هەڵقوڵاوی بارودۆخ و ژینگەی دەرەکی بڕیار بەدەستن، بە واتایەکی دی، کۆی کاریگەری تایبەتمەندی‌یەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتین، لەسەر ڕەفتاری سیاسی دەرەکی دەوڵەت))[1].

هەر بۆیە ئەم فاکتەرانە کاریگەرێتی‌یان هەیە لەسەر ئازادی جموجۆڵ و بزاوتی بڕیار بەدەستی ئەو یەکە نێودەوڵەتیانەی کە سیستمی نێودەوڵەتی پێك دێنن، هەروەها ئاستی سەرکەوتنی بڕیار بەدەست بەم کۆت و پێوەندانەوە بەندە، لەبەر هەموو ئەمانە هۆکاری گرنگ لە ژینگەی نێودەوڵەتیدا، کە کار دەکاتە سەر ئاستی سەرکەوتنی بڕیاری سیاسی دەرەکی بریتی‌یە لە سیاسەت و ڕەفتاری لایەن و یەکە نێو دەوڵەتیەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی نێودەوڵەتی.

هەروەها ((ئەم فاکتەرانە سیستمی نێودەوڵەتی و مەسافەی نێودەوڵەتی (المسافة الدولية) و کارلێکی نێودەوڵەتی و هەڵوێستی نێودەوڵەتی دەگرێتەوە))[2].

لەسایەی جیهانی هاوچەرخ و شۆڕشی پەیوەندیەکان و مەعریفەو زانستدا پەیوەندی نێوان یەکە نێودەوڵەتیەکان زیاد دەکات، بەمەش ئەو کارو کاردانەوەیەی، کە کار دەکاتە سەر سیاسەتی دەرەکی وولاتان، زیاد دەکات، بۆیە بە باشمان زانی لەم بەشەداو لەسێ باسدا جەخت لەسەر ئەم فاکتەرە دەرەکیانە بکەین:-

- سروشتی سیستمی سیاسی نێودەوڵەتی.
- ڕێکخراوە حکومی یەکان (هەرێمی و نێو دەوڵەتیەکان).
- ڕێکخراوە ناحکومیەکان.
- کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان.
- هەروەها فاکتەرە مەعنەویە نێودەوڵەتیەکان کە خۆی لە یاسای نێودەوڵەتیو ڕای گشتی جیهانیدا دەبینێتەوە.

# باسی یەکەم

## سروشتی سیستمی سیاسی نێودەوڵەتی

ئامانجو توانای یەکە نێودەوڵەتیەکان لە سەردەمو کاتێکەوە بۆ سەردەمێکی تر جیاوازەو گۆڕانی بەسەردا دێت، ئەمەش دەبێتە مایەی گۆڕینی سیاسەتەکانیو ئەو کاریگەریە لەسەر سیستەمی نێودەوڵەتی بەجێدەهێڵێت، کە دەبێتە مایەی گۆڕینی پەیکەری (الهیکل)ی سیستمی سیاسی بە شێوەیەکی بەردەوامو گۆڕانی هاوسەنگی هێزەکان لە قۆناغو سەردەمێکەوە بۆ قۆناغێکی تر، لەبەر ئەوەی یەکە نێودەوڵەتیەکان بە شێوەیەکی بەردەوام لەنێو خۆیاندا کاردەکەنو تواناو کاریگەرێتییان لە سیستمی نێو دەوڵەتیدا یەکسان نیە، هەر بۆیە لە زۆربەی کاتدا بە بەرژەوەندی زلهێزەکان تەواو دەبێت.

((بارودۆخی نێودەوڵەتی یان جمو جۆڵێکی خێرایە (بۆ نموونە ڕوودانی جەنگ)، یاخود خێراییەکەی مام ناوەندە (بۆ نموونە جەنگی سارد (Cold War)، یان خێراییەکەی سستە (بۆ نموونە بارودۆخی ئاسایی) )).[٣] ئەمەش ئەوەمان نیشان دەدات کە بارودۆخی نێودەوڵەتی لە هەموو قۆناغەکاندا لە جمو جۆڵدایەو خێرایە بەڵام بە پلەی جیاواز.

لەبەر ئەوەی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان کاریگەرێتی شۆڕشی تەکنەلۆجیو پێشکەوتنی هۆکارەکانی پەیوەندیو ئاڵوگۆڕ کردنیان لەسەرە، وەك (ماك لوهان) دەڵێت: جیهان بوەتە گوندێکی گەردونی. وڵاتان لە

سایەی ((گوندی گەردونی))دا کاریگەریّتی بنەما گشتییەکان و سیفەتەکانی سیستمی نیّودەوڵەتیان لەسەرە، لەوانە: جۆری دابەش بوونی هیّزەکان، تاك جەمسەری یان دوو جەمسەری یاخود فرە جەمسەری. وە جەمسەرگیری لە پیّکهاتەی نیّودەوڵەتیدا کار دەکاتە سەر شیّوازی بڕیاردان، چ لەناو بازنەی هاوپەیمانیّتیدا بیّت یان لە نیّو وولاّتاندا. بۆ نموونە: یەکریزی (التماسك) هاوپەیمانیەتیەکان وا دەکات دەوڵەتانی ئەندام لە هاوپەیمانیّتیدا هەوڵ بدەن بۆ گەیشتن بە سیاسەتیّکی هاوبەش بەرامبەر بە کیّشە نیّو دەوڵەتیەکان، پیّش ئەوەی پیّشنیارەکان پیّشکەش بە هاوپەیمانە نەیارەکانیان بکەن (وەك دانوستان بۆ چەك داماڵین).

بەلاّم لەسەردەمی دوو جەمسەری مەزن دا بە پیّچەوانەوەیە، بۆ نموونە هەوڵی بەدەست هیّنانی ڕەزامەندی وولاّتانی ئەندامی ناتۆ ((NATO)) کەم بوە پیّش ئەوەی پرۆژەکەیان پیّشکەشی یەکیّتی سۆڤیەتی پیّشوو بکریّت.[٤] ئەمەو کاریگەریّتی ئەو وولاّتانەی سەر بە دوو جەمسەرن لە سایەی سیستمی دوو جەمسەریدا لە سەردەمیّکەوە بۆ سەردەمیّکی تر گۆڕانی بەسەردا دیّت ((وە پەیوەندی پاشکۆیانەی ئەم دەوڵەتانە بە دوو جەمسەرەکەیەوە وا دەکات زۆرجار لەلایەن زلهیّزەکانەوە بۆ جیّبەجیّکردنی سیاسەت و بەرژەوەندیەکانیان بەکار بهیّنریّن، بە شیّوازیّك کە جەنگ لەبری ئەوان ئەنجام بدەن (الحرب بالنیابة)، ئەمە لەگەڵ فەراموّش نەکردنی قۆستنەوەی ئەم پەیوەندیە بۆ بەرژەوەندی وولاّتە پاشکۆکان، بەمەرجیّك کە زیان بە بەرژەوەندی وولاّتە گەورەکان نەگەیەنیّت))[٥] وەك لە سەردەمی دوو جەمسەریدا ڕویداوە زۆرجار، ئەمەش بە ڕوونی لە مەسەلە سیاسیەکاندا بەدەر دەکەوت.

ئەمەو بڕیاری سیاسی لە گۆڕەپانی نیّودەوڵەتیدا لایەنگرو پشتیوانی دەبیّت، هەروەك چۆن دژو بەرهەڵستکاری دەبیّت، وە هەندیّك لایەن بۆ بەدیهیّنانی بەرژەوەندیەکانیان بێ لایەنی هەڵدەبژیّرن لەم چوارچیّوەیەدا ئەو ئەگەرانەی ڕووبەڕووی خاوەن بڕیار دەبنەوە ئەمانەن[٦]:-

١- بازنەی ئەو هیّزانەی ئەگەری پشتیوانیان لیّ چاوەڕوان دەکریّت (دۆست و پشتیوانان، لایەنگرە ماددی و مەعنەویەکان، لایەنگری سەر زارەکی...).

٢- بازنەی ئەو هێزانەی ئەگەری نەیاری و دژایەتیان لێ چاوەڕوان دەکرێت (نەیاران بە هەڵوێستی ڕون و ئاشکرا، نەیارانی لایەنگری دوژمن، نەیارانی هاوبەش و هاوکاری دوژمن).

٣- بازنەی ئەو هێزانەی ئەگەری بێ لایەنیان لێدەکرێت.

چالاکیە سیاسی و دیبلوماسیەکان توانای کەم کردنەوەی بازنەی نەیاران بۆ بێ لایەنی و گۆڕینی هێزە بێ لایەنەکان بۆ هێزی دۆست و لایەنگرانیان هەیە، هەروەك چۆن ئەم چالاکیانە کارکردن لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتیدا ئاسان دەکەن، بە شێوەیەك کە بڕیاری سیاسی ئەگەرو هەلی سەرکەوتنی بەدەست بهێنێت. بۆ نموونە: ئەم کارو چالاکیانە بە ڕوونی لەکاری سیاسی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بەدی دەکرێت و جێبەجێی کردووە لەمیانەی بەرپاکردنی جەنگی دژی ئەو وڵاتانەی کە لەنێو لیستی تیرۆریستاندا دایناون و لە بڕیاریشدا بۆ جەنگی دژی ئەفغانستان و عێراق و ئەو وڵاتانەی ئەگەری لێدانیان دەکرێت لە لایەن ئەمریکاوە، بە شێوەیەك کە هەموو هێزو تواناکانی خۆی بەگەڕ خستووە بۆ بەدەست هێنانی فراوان ترین هاوپەیمانێتی نێودەوڵەتی بۆ دژایەتی کردنی نەیارانی خۆی، ئەم هەنگاوانەی بە پاڵپشتی کاری دیبلۆماسی بەردەوام ئەنجام دەدات تا ئەوپەڕی توانا بڕیارو کارەکانی سەرکەوتوو بێت و ڕای گشتی جیهانیش لەسەر هەردوو ئاستی ڕەسمی و ناڕەسمی (دەسەڵات و جەماوەر)دا بۆلای خۆی ڕابکێشێت. سیستمی سیاسی نێودەوڵەتی بەم پەیکەرەی ئێستایەوە (تاك جەمسەری) چەندین تایبەتمەندی لەخۆ گرتووە، بە شێوەیەك جیا دەکرێتەوە لە قۆناغەکانی پێشووتر، جیا دەکرێتەوە بە تایبەتمەندی فرە لایەنی (اللاتجانس)و فرە بەرژەوەندی، کە جۆری کارلێکی نێوان یەکە سیاسیە پێکهێنەرەکانی بارودۆخ و واقیعی نێودەوڵەتی دیاریدەکەن، بۆ نموونە: وڵاتانی باشوور لەکۆمەڵە دەوڵەتێك پێکدێن کە لەڕووی تواناو هێزەوە جیاوازن لەیەکتری و ناتوانن ویست و بەرژەوەندییەکانیان لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتیدا بسەپێنن، هەروەها خاوەنی ناوەندێکی بڕیاری بەهێزنین کە بتوانێت چەند هەڵوێستێکی سیاسی نێودەوڵەتی گەڵاڵە بکات لە بەرامبەر ئەو کێشەو قەیرانانەی کە هەڕەشە لە ئاسایش و سەربەخۆیی یان دەکات. دەبینین ئەم دەوڵەتانە بونەتە پاشکۆ لە ڕووی سیاسی و ئابوریەوە بۆ وڵاتانی باکور لە ئەنجامی لاوازی سیاسیاندا، بەڵام وڵاتانی باکور پشت بە

ستراتیجیەتی پەراوێز خستن‌و سەرقاڵ کردن دەبەستن بەرامبەر وڵاتانی باشور، ئەمەش لەمیانەی قوڵکردنەوەی پاشکۆیەتیان لە ڕووی سیاسی‌و ئابوریەوە بۆ وڵاتە پیشەسازیە پێشکەوتووەکان.

لە جیهانی ئەمڕۆدا کە بەتاکە جەمسەری‌و هەژمونی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ڕۆڵی کاریگەری لە نەتەوە یەکگرتووەکان‌و ئەنجومەنی ئاسایش ناسراوە، زۆربەی وڵاتان هەوڵ دەدەن پەیوەندیان لەگەڵ ئەمریکادا باش بکەن، بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندیە سیاسی‌و ئابوریەکانیان، ئەمەش پاشکۆیەتی زۆربەی وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان بۆ ئەمریکا ڕوون دەکاتەوە.

بڕیاری سیاسی دەرەکی لەهەر دەوڵەتێکدا ڕەفتاری دەوڵەتانی تر کاری تێدەکات، بۆ نموونە: لەکاتی ململانێی نێوان دوو دەوڵەت لایەنەکانی تر (لایەنی سێهەم) ڕۆڵی خۆیان دەبینن بۆ کار کردنە سەر ڕەفتاری دوو دەوڵەتە ناکۆکەکە بەڕێگای خستنە ڕووی (وساطة) یان کۆمەکی ئابوری یان سەربازی‌و سیاسی، یاخو لەڕێگای بەکارهێنانی، یان بە شێوەی هەڕەشە، یاخود سەر زەنشت کردن یان کێشانەوەو وەستاندنی کۆمەکی سەربازی‌و ئابوری‌و سیاسی، بۆیە هەر بڕیارێك پەیوەندی بە جەنگەوە هەبێت، پێویستە ئەگەری کاردانەوەی لایەنی سێهەمی تێدا ڕەچاو بکرێت.[٧]

لەم سۆنگەیەوە بۆمان دەرکەوت کە وڵاتان لە دەرکردنی بڕیارە سیاسیە دەرەکیەکاندا پێویستە ڕەچاوی چەند کۆسپ‌و لەمپەرێکی نێودەوڵەتی بکەن کە لە دەرەنجامی فشاری سیاسی نێودەوڵەتیەوە دروست دەبێت، وە هەر کاتێك فشاری نێودەوڵەتی زیاد بکات بواری کارو جوڵان‌و ڕەخسانی هەلی سەرکەوتن کەم دەبێتەوە. بەڵام هەر کاتێك فشار کەم بێتەوە ئەوا جێگرەوەکان‌و هەل‌و بواری هەڵبژاردن زیاد دەکات.[٨]

ماوەتەوە بڵێین سیستمی سیاسی نێودەوڵەتی بە یەکێك لەو فاکتەرانە دەژمێررێت کە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر دەگۆڕێت‌و لەهەر قۆناغێکیشدا ڕۆڵی دیاری کراوی خۆی دەبێت.

# باسی دووەم

## یەکە سیاسییە نێو دەوڵەتییەکان

لەم باسەدا لە ڕێکخراوە نێو دەوڵەتی یەکان و کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان دەدوێین، کە وەك دوو یەکەی نێودەوڵەتی کار لە پرۆسەی دروست کردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی دەکەن:-

**یەکەم:- ڕێکخراوە نێودەوڵەتی یەکان:-**

چوارچێوەی ڕێکخراوە نێودەوڵەتی یەکان بە یەکێك لە کارتێکەرە دەرەکی یەکان دادەنرێ لە پرۆسەی دروست کردنی بڕیاری دەرەکی هەر دەوڵەتێکدا، ئەمەو پلەی کاریگەرێتی لە ڕێکخراوێکەوە بۆ ڕێکخراوێکی دی دەگۆڕێ بەپێی گرنگی ڕێکخراوەکە بۆ وولاتەکە، هەروەها لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی تریش دەگۆڕێت بەپێی توانای دەوڵەت لە ڕووبەڕوو بونەوەی ئەو فشارانەی کە بەهۆی ئەندامێتی یەوەلە ڕێکخراوێکی دیاری کراودا ڕووبەڕووی دەبێتەوە.[٩]

مەبەستمان لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتی یەکان، حکومی و ناحکومی یەکانیش دەگرێتەوە، ڕێکخراوە نێودەوڵەتی یە حکومی یەکان بەشداری لایەنێکی گرنگی کارلێکی نێو دەوڵەتی، دەکەن هەر بۆیە کاریگەرێتی جۆراو جۆر لەسەر ڕەفتاری سیاسی دەرەکی وولاتان و جۆری ژینگەی دەرەکیان بەجێ دەهێڵن، ئەم کاریگەرێتیەش بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لەو ڕێکخراوانەدا دەردەکەوێت کە خاوەن ئاڕاستەیەکی کاملن واتە سروشتێکی ئیلزامی یان پێوە دیارەو دەتوانن بڕیاری سیاسی گەردنگیر (ملزم) بەسەر هەریەك لەو وولاتانەدا بسەپێنن کە تێیاندا ئەندامن، ئەمە بەبێ ڕەچاوکردنی ویستی سیاسی وولاتەکە، بەم شێوەیە پرۆسەی بڕیاردان تەنها لەلایەن دەوڵەتەوە قۆرخ نەکراوە[١٠]، بۆ نموونە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە ئەمڕۆ بە بالاترین جۆرەکانی ڕێکخستنی نێودەوڵەتی دەژمێردرێت، ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە پەیوەندی یە نێودەوڵەتی یەکان و دیاری کردنی ڕەفتاری وولاتاندا

وەك: چارەسەری ناكۆكی‌یە نێودەوڵەتی‌یەكان بە ڕێگەی جۆراو جۆر، هەروەها بابەتی دەست تێوەردانی مرۆیی.

بە پێی میساقی نەتەوە یەكگرتووەكان پێویست كراوە لەسەر ئەندامانی ڕێكخراوی نێودەوڵەتی نەتەوە یەكگرتووەكان كە پەنا ببەنە بەر شێوازی ئاشتیانە بۆ چارەسەری ئەو ناكۆكیە نێودەوڵەتیانەی كە هەڕەشە لە ئاشتی‌و ئاسایشی نێودەوڵەتی دەكەن.

لەم بارانەدا ڕێكخراوی نێودەوڵەتی ڕێ‌و شوێنی كاریگەر دەگرێتەبەر وەك لە ماددەی (٤٢)ی میساق دا ئاماژەی بۆ كراوە.[١١]

جگە لە ڕێكخراوە حكومیە نێودەوڵەتیەكان چەندین ڕێكخراوی هەرێمی‌ی (ناوچەیی) هەیە، وەك ڕێكخراوی كۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبی‌و ڕێكخراوی یەكێتی ئەفریقا... هتد. كە هەوڵ دەدەن بۆ گەشەپێدانی هاوكاری نێوان ئەندامانیان لە بوارەجیاجیاكاندا.

ئەمەو ڕۆڵی هەریەك لەم ڕێكخراوانەو كاریگەرێتی‌یان لەسەر ڕەفتاری وڵاتانی ئەندام لە ڕێكخراوێكەوە بۆ ڕێكخراوێكی تر دەگۆڕێت.

ئەمەو میساقی هەریەك لەم ڕێكخراوانە، جیهانی بن یان ناوچەیی، هەروەها ئاستی نزیكی وڵاتانی ئەندام تێیدا، وە ئاستی بوونی ئامرازو میكانیزمی كاریگەر بۆ جێبەجێكردنی بڕیارەكانیان بە تایبەت ئەوانەی پەیوەندییان بە چارەسەری ناكۆكیە نێودەوڵەتیەكان‌و ناوچەیی‌یەكانەوە هەیە، هەموو ئەمانە بە بنچینەی ڕۆڵی ئەم ڕێكخراوانە دادەنرێت، واتە بەگۆڕانی ئەم فاكتەرانە ڕۆڵی ڕێكخراوەكانیش دەگۆڕێت، هەروەها كاریگەرێتی ڕێكخراوە نێودەوڵەتیەكان لە كارلێكە ناوچەیی‌و جیهانیەكاندا، لە ئاستی كاریگەرێتی جوڵانەوەی سیاسی دەرەكیانەوە سەرچاوە دەگرێت، هەروەك چۆن لەو سوودانەی كە بۆ وڵاتانی ئەندام بەدی دەهێنن سەرچاوە دەگرێت، چونكە ئەو سودانە پاڵنەرن بۆ ئەندامان بۆ بەكارهێنانی ڕێكخراوەكانیان وەك ئامرازێك بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندیەكانی خۆیان لە هەلومەرجە سیاسیەكاندا، ئەمەش لەمیانەی چوار ئاستی بنچینەیی‌دا خۆی دەبینێتەوە[١٢]:-

١- هەندێك لە وڵاتانی ئەندام لە ڕێكخراوە نێودەوڵەتیەكاندا ڕێكخراوەكە بەكاردەهێنن بۆ دابین كردنی سودو قازانجگەلێكی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، وەك دەستخستنی كۆمەك‌و یارمەتی.

٢- هەندێك لە وڵاتان ڕێكخراوە نێودەوڵەتیەكان بەكاردێنن وەك ئامرازێك كە كاریگەری بەكۆمەڵی هەیە، تا ڕێكخراوەكە چەند سیاسەتێكی ئەوتۆ بگرێتە بەر كە لە بەرژەوەندی وڵاتەكەیاندا بێت.

٣- ڕێكخراوە نێودەوڵەتیەكان هەل بۆ وڵاتانی ئەندام دەڕەخسێنن تا ڕێكخراوەكان وەك ئامرازێك بەكاربهێنن بۆ ڕزگار بوونی لە هەڵگرتنی ئەركی بەرپرسیارێتی‌و چەند ئەركێكی دیاریكراو كە دەوڵەتەكە ویستی لەسەری نی‌یە.

٤- ئەگەری بەكارهێنانی ڕێكخراوەكان بە مەبەستی سەرنج ڕاكێشانی ڕای گشتی نێودەوڵەتی‌و جیهانی.

لەم سۆنگەیەوە بۆمان دەردەكەوێت كە ڕێكخراوە حكومیە نێودەوڵەتی‌و ناوچەیی‌یەكان وەك یەكەیەكی نێودەوڵەتی كاریگەرێتی بەرچاویان هەیە لە سیاسەتی دەرەكی وڵاتاندا، ئەمە سەبارەت بە ڕێكخراوە حكومیە نێودەوڵەتیەكان، جیهانی‌و ناوچەیی‌یەكانی.

دەكرێت لێرەدا بپرسین ئایا ڕێكخراوە ناحكومیەكان كاریگەرێتی‌یان هەیە لەسەر پرۆسەی دروستكردنی بڕیاری سیاسی دەرەكی؟ ڕێكخراوە ناحكومیەكانیش بەشداری لە ژیانی سیاسی نێودەوڵەتیدا دەكەن، ئەمەو كاریگەرێتی‌یان هەیە لەسەر حكومەتەكان‌و دام‌و دەزگاكانی دروستكردنی بڕیار تێیاندا، هەروەها ڕۆڵی ئاشكرایان هەیە لە دانانی خشتەی كارو پلان‌و داڕشتنی سیاسەتدا، دواتر لە جێبەجێكردنیشدا. هەروەها ئامرازێكی گرنگە بەدەست كۆمەڵگەكانەوە بۆ خۆ دوور خستنەوە لە ململانێ‌یەكان، هەروەك هەڵدەستن بە ڕۆڵی ناوبژیوانی لەنێوان لایەنە ناكۆكەكاندا لە پێناو گەیشتن بەصیغەو میكانیزمێكی ئاشتیانە بۆ چارەسەركردنی ناكۆكی‌و جیاوازیەكان.

سروشتی ناحكومی ئەم ڕێكخراوانە وا دەكات گۆڕەپانێكی فراوانی كاركردن بگرێتە خۆ، هەرچەندە توانای دارایی‌یان سنوردارە، لەگەڵ ئەوەشدا

جێمتمانەیان زیاترە لە ناوبژیوانە ڕەسمییەکان زۆر جار ڕێکخراوە ناحکومییەکان ڕۆڵی کاریگەر دەبینن لە کوژاندنەوەو کپ کردنی کێشە ناوخۆییو ناوچەییەکاندا، هەروەها لە چەندین بواردا فشار دەخەنە سەر حکومەتەکان.[١٣]

هەرچەندە ژمارەی ئەم ڕێکخراوانە بەرەو زیادبوون دەڕوات و ((دەگاتە نزیکەی (٣٦) سیوشەش هەزار ڕێکخراوی ناحکومی))[١٤] وە چالاکیشیان لە زیاد بووندایە، بەلام ڕۆڵی کاریگەریتییان لەسەر حکومەتەکان تا ئێستاش جۆرێك لە لاوازی پێوە دیارە، ئەمەش لەبەر ئەوەی دەسەلاتی دەرکردنی بڕیاری گەردنگیر نیە بەسەر وولاتاندا، بەڵکو دەرکردنی بڕیار لە زۆربەی بوارەکاندا لەلایەن دامو دەزگاکانی دەوڵەتەوە قۆرخ کراوە. بەلام لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی ئەم ڕێکخراوانەو هەمەجۆری شێوازو ڕێبازو میکانیزمی کارەکانیان دەخوازرێت ببنە فاکتەرێکی کاراو کاریگەر لە فاکتەرەکانی ئاسایشو ئارامی لەبارودۆخی نێودەوڵەتیدا، ئەمەش بەڕێگەی کاریگەریان لەسەر حکومەتە جۆربەجۆرەکانو بڕیار بەدەستان بەو ئاڕاستەیەی کە ئاشتیوهاوکاری نێودەوڵەتی بهێنێتە دی...

**دووەم:- کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان**

مەبەست لە کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان ئەو کۆمپانیا زەبەلاحو گەورانەن کە لە چەندین کۆمپانیای بچوكو لاوەکی پێك دێنو لە چەندین وولاتی پیشەسازیدا کار دەکەنو بەرهەمەکانیان لە چەندین وولاتی جۆراوجۆردا دەفرۆشن، ئەم کۆمپانیایانە لە دەرەوەی سنوری وولات کاردەکەن، کە لقی کۆمپانیایەکن کە سەر بە کۆمپانیا سەرەکیەکانن لە وولاتی دایك دا، ئەم کۆمپانیایانە سنوری سیاسی دەبەزێنن، دەوڵەتی دایك کار دەکات بۆ فراوان کردنی چالاکی کۆمپانیاکانی بە مەبەستی دەست گرتن بەسەر بازاڕی دەرەکیدا.[١٥]

ژمارەی ئەم کۆمپانیایانە بە تایبەت لەم قۆناغەی ئەمڕۆدا بەهۆی تەکنەلۆجیای هاوچەرخەوە ڕۆژ بەڕۆژ لەزیاد بوندایە، وە بە یەکێك لە ڕاستیەکانی دیاردەی نێودەوڵەتی دادەنرێن. ئەمەو ئەم کۆمپانیایانە چالاکی دەرەکیان لەسەر ڕووبەرێکی فراوان بڵاوبوەتەوە کە چەندین وولاتی پێشکەوتوو و تازە پێشکەوتوو لەیەك کاتدا دەگرێتەوە، بە تایبەت کۆمپانیا گەورەو زەبەلاحەکان، کە خاوەنی توانایەکی ئابوری ئەوتۆن کە هەندێك جار

لە داهاتی نێوخۆیی چەندین وڵاتی تازە پێگەیشتوو زیاترە. کاریگەری نێودەوڵەتی ئەم کۆمپانیایانە بەشێوەیەك فراوان‌و درێژ دەبێتەوە کە دەوڵەتی دایك‌و دەوڵەتانی پێشوازیکەر لە کۆمانیاکە دەگرێتەوە، چ جای لە سیستمی سیاسی نێودەوڵەتی چونکە ئەم کۆمپانیایانە زۆرجار بەشداری لە دروستکردنی بڕیاردا دەکەن، دەوڵەتی دایکیش کۆمپانیاکان بۆ پشتگیری کردنی سیاسەتی دەرەکی خۆی بەکاردەهێنێت.

هەرچەندە بوونی ئەم کۆمپانیایانە لە دەوڵەتە پێشوازیکەرەکان بە تایبەت تازە پێگەیشتووەکان لایەنی پۆزەتیڤ‌و نێگەتیڤی خۆی هەیە، ئەمەو هۆکاری زاڵ بونیان بەردەوام‌و نەگۆڕ نیە، هەروەها یەك شێوازیش ناگرێتە خۆ، بارو هەلومەرجی ئابوری‌و دارایی‌و تەکنەلۆجی‌و سیاسی کۆمپانیاکان کە ئەو ژینگەیە پێك دەهێنن، کە کۆمپانیاکان لە چوارچێوەیدا کاردەکەن لە نێوخۆی دەوڵەتی دایك‌و دەوڵەتی پێشوازی کەردا، دەستنیشانی قورسایی‌و باڵا دەستی دەوڵەتێکی ئەوتۆ دەکات بەسەر دەوڵەتێك یان چەند دەوڵەتێکی ترەوە.[١٧]

لە ڕاستیدا کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان ڕۆڵێکی کاریگەر دەبینن لە سیستمی نێودەوڵەتی هاوچەرخدا، جا ئەم ڕۆڵ‌و کاریگەرێتی‌یە یان بە ڕێگای سەربەخۆ‌و بە پەیڕەوکردنی سیاسەتی دەرەکی کۆمپانیاکان خۆیانەوە دەبێت، یاخود لە ڕێگای بەکارهێنانی کۆمپانیاکانەوە دەبێت لە لایەن وڵاتە پێشکەوتووەکانەوە بۆ فشار خستنە سەر وڵاتانی باشورو سەپاندنی نەخشەو پلان‌و بەرژەوەندیەکانیان بە سەریاندا، ئەمە لە کاتێکدا کە ((٩٠٪ ی ئەم کۆمپانیایانە سەربە سێ کوچکەی (ئەمریکی- ئەوروپی- یابانی)ن))[١٨]وە قازانجەکەشیان - کە لە هەندێك حاڵەتدا چەند قاتی سەرمایەکەیان دەبێت - دەگەڕێتەوە گیرفانی خۆیان.لێرەدا ڕۆڵی بەرژەوەندیە ئابوریەکانمان بۆ دەردەکەوێت لە گۆڕینی سیاسەتی دەرەکی دەوڵەتان‌و کاریگەرێتی‌یان لەسەر یەکتری.

دەتوانرێت شوێنەواری ڕەفتاری نێودەوڵەتی کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان لەمیانەی ئەو ڕۆڵە دوو فاقەیی‌یەوە (المزدوج) دیاری بکەین کە دەیگێڕن، لە لایەکەوە دەکرێت ئەم کۆمپانیایانە ببنە ئامرازێك لە ئامرازەکانی زاڵبوون‌و فراوان بوونی دەسەڵات بەدەست دەوڵەتی دایکەوە، لەلایەکی ترەوە دەکرێت ئەم کۆمپانیایانە وەك یەکەیەکی کارای نێو دەوڵەتی دەربکەون کە توانایەکی

ڕاستەقینەیان لەبەر دەستدا بێت بۆ کاری سەربەخۆو دوور لە دەوڵەتی دایك.[١٩]

کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان کار بۆ ئەوە دەکەن کە بگەنە سەرچاوەو ناوەندەکانی بڕیار لەو دەوڵەتانەدا کە سەرمایەکەیانیان تێدا وەبەر دەهێنن. بۆ نموونە: کاتێك کۆمپانیای (کرایسلەر)ی ئەمریکی وەستاندنی کاری ڕاگەیاند لەو کارگەیەیدا کە لە بەریتانیا بوو لە سکوتلەندا، کارێکی وای کرد کە نزیك بوو قەیرانێکی سیاسی لێ بکەوێتەوە لە بەریتانیا، چونکە ئەم بڕیارە هانی بزوتنەوەی جودا خوازی سکوتلەندای‌دا کە بگەڕێتەوە بۆ چالاکی خۆی‌و داوای جیابوونەوە بکات لە بەریتانیا.

لە وولاتە تازە پێگەیشتووەکانیشدا ئەم کۆمپانیایانە فشارە ئابوریەکانیان بەکاردەهێنن بۆ گۆڕین‌و هەموار کردنی بڕیارە سیاسیەکان یان گۆڕینی سیستمی فەرمانڕەوایی، هەروەك چۆن لە گواتیمالا ڕووی‌دا کاتێك کۆمپانیای میوە فشارە ئابوریەکانی خۆی لە دژی حکومەتی نیشتمانی لە وولاتەکەدا بەکارهێنا.

لە ڕاستیدا تا کاروباری کۆمپانیاکان زیاد بکات، جۆرو شێوازی پەلهاویشتنی زیاد دەکات، بۆ نموونە: کۆمپانیاکان دەتوانن دزە بکەنە ناو وولاتانەوە لە ڕێگەی ئەو کۆمەکیانەی پێشکەش بە زانکۆو دامەزراوە زانستیەکانی دەکەن لە وولاتە تازە پێگەیشتوەکاندا، یاخود لە ڕێگەی پێشکەش کردنی پسپۆڕی‌و شارەزایی خۆرایی‌یەوە بەو وولاتانە، بەو شێوەیەی کۆمپانیاکان ویستیان لەسەریەتی‌و دیاری دەکەن، هەندێك جاریش بەرتیل دەدەن بە سەرۆك یان بەرپرسانی دەوڵەتان لە پێناو ڕاکێشانی سۆزو خۆشەویستیان بەلای خۆیاندا.[٢٠]

لێرەدا ڕۆڵی کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکانمان لەسەر بڕیار بەدەستانی وولاتە تازە پێگەیشتووەکان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

ماوەتەوە بڵێین تا چەندێك کۆمپانیاکان توانای کارو چالاکی هەمەجۆرو چوارچێوەی کارو جۆری میکانیزمەکانی زیادو باش‌و فراوان بێن، زیاتر بواریان بۆ دەڕەخسێت کار لە بڕیاری سیاسی بکەن لەو وولاتانەدا کە کاری تێدا دەکەن.

# باسی سێهەم

## فاکتەرە مەعنەوی یە نێودەوڵەتی یەکان

هەموو یەکەیەکی نێودەوڵەتی هەوڵی بەدیهێنانی بەرژەوەندیو ئامانجەکانی خۆی دەدات بە ڕێگاو میکانیزمی جۆراو جۆر، بەلام لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەدات: ئایا ئەم ڕێگاو میکانیزمانە هیچ کۆسپو لەمپەرێکی مەعنەوی نایەتە ڕێگەیانو سنوورداریان ناکەن؟

لە ڕاستیدا چەند فاکتەرێکی مەعنەوی نێودەوڵەتی هەیە کە چەند کۆتێك لەبەردەم بڕیار بەدەستاندا دادەنێن کەوای لێدەکەن نەتوانێت تەنها بەویستی خۆی هەڵسوکەوت بکات، یاخود بە ئاراستەیەکدا کە لەگەڵ واقیعی نێودەوڵەتی هاوچەرخو بەرژەوەندی یەکە نێودەوڵەتی یەکانی تردا نەگونجێت، یان بە پاساوی سەروەری یەوە لە دژی بەرژەوەندیو مافەکانی گەلەکەی مامەڵە بکات. بۆیە لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوەش بدەین کە ((هەوڵدان بۆ گرنتی کردنی بەرژەوەندی دەوڵەت لە لایەن بڕیار بەدەستانەوە نابێتە هۆیەك بۆ پێشێلکردنی ئەو بنچینە یاساییو ئەخلاقیانەی کە هەموو لایەك لەسەری کۆکن))[٣١].

بۆیە لەم باسەدا لە دوو فاکتەری سەرەکی مەعنەوی دەدوێین کە سنوری کاروبڕیار بەدەستان تەسك دەکەنەوە ئەوانیش بریتین لە:

١- یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخ.

٢- ڕای گشتی جیهانی.

### یەکەم:- یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخ

مەبەست لە یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخ ئەو هێزە ماددیو مەعنەویانەیە کە داموو دەزگاکانی یاسای نێودەوڵەتی هەیانەو کاری ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان وولاتانو تاکەکانیان پێ سپێردراوە، پێویستە بڕیار بەدەستان ڕەچاوی یاسای نێودەوڵەتی بکەنو سووربن لەسەر ئەوەی کە بڕیارەکانیان، جیاوازیەکی ئابڕووبەری نەنوێنێ کە لە هەندێ کاتدا

کاریگەریەکەی لە شێوازێکی ئەخلاقیەوە بۆ شێوازێك دەگوێزێتەوە کە دامو دەزگا نێودەوڵەتیەکان سزای لە بەرامبەردا بەکاردێنن وەك سەرزەنشتو دابڕینی سیاسیو ئابوری. لەم بارەدا بێگومان زیانێکی زۆر بە ئامانجی بڕیارە سیاسیەکە دەگات.[٢٢]

لەم میانەیەوە یاسای نێودەوڵەتی ڕۆڵی ئاڕاستەکردنی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان دەبینێ لەبواری بنچینەکانی ڕەفتار کردندا. گرنگترین ناوەندەکانی یاسای نێودەوڵەتی بریتیی یە لە (دادگای نێودەوڵەتی) کە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت بە تایبەت لە چارەسەرکردنی ناکۆکیە نێودەوڵەتیەکان هەروەك چۆن ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی - لەگەڵ ئەو کەلێنانەی تێیدایە - ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە چارەسەرکردنی زۆرێك لە کێشەنێودەوڵەتیەکان. لەو کەلێنانەش: مافی ڤیتۆ و فەرزکردنی ئیرادەی پێنج ئەندامە هەمیشەییەکەی بەسەر کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا بەپێی بەرژەوەندی‌یەکانیان، بەتایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

بەڵام لەگەڵ ئەو ڕۆڵو کاریگەری‌یەی کە ئەم ناوەندانە دەگێڕن زۆرکات دەوڵەتان مل کەچی ئەو بڕیارە نێودەوڵەتیانە نابن کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیاندا ناگونجێت.

یاسای نێودەوڵەتی زادەو دەرەنجامی مامەڵەی نێوان دەوڵەتانو کاریگەرێتی ئەو دابو نەریتانەیە کە دەبن بە عورفو بنەماو یاساگەلێك کە دەوڵەتان ڕازین بەسەر خۆیاندا جێبەجێی بکەن، ئەم یاساو بنەمایانەش یاساو بنەمایەکن بۆ ڕێکخستنی ڕەفتارەکانی دەوڵەت، بە واتایەکی تر، یاساو بنەمایەکن کە جۆرو شێوازی کاروڕەفتاری دەوڵەت دیاریو سنوردار دەکەن لە بواری جێبەجێ کردنی سیاسەتی دەرەکیاندا.[٢٣]

لەگەڵ ئەوەی کە دامو دەزگاکانی یاسای نێودەوڵەتی دەسەڵاتێکی ناوەندی‌یان نیە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، ناتوانن بڕیارەکانیان هەمیشە یەکلاکەرەوە بێت لە چوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتیدا، وەك هەندێك جار دەبینین دەوڵەتان پەنا دەبەنە بەر سنور شکاندنو بەزاندنی بنچینە یاسایی‌یە نێودەوڵەتیو بڕیارە نێودەوڵەتیەکان - وەك قەوارەی زایۆنی - بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بەکەم سەیری ئەو یاساو ڕێساو بڕیارە نێودەوڵەتیانە بکەین، چونکە ئەم یاساو بڕیارانە زۆرجار توانای ئەوەیان

هەیە کە دەوڵەت یان یەکەی سەرپێچیکەر گۆشەگیر بکەن و لە لایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیەوە سەرزەنشت بکرێت، وە دەکرێت لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەربکرێت.

پوختەی ئەم باسە لەوەدا کۆدەبێتەوە کە یاسای نێودەوڵەتی و بڕیارە نێودەوڵەتی یەکان، زۆرکات، کاریگەری لەسەر یەکە سیاسیەکان دروست دەکەن، بەڵام ئەم کاریگەرێتی یە زۆر جار بەو ئاڕاستەیەدا دەبێت کە لەگەڵ بەرژەوەندی وولاتە زلهێزو کاریگەرو بە تواناکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی نێودەوڵەتیدا بگونجێت، لەم بوارەشدا پشکی شێر هەنوکە بەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کەوتووە. واتە دەکرێت یاساو بڕیارە نێودەوڵەتیەکان و داموو دەزگاکانیشیان بۆ بەدیهێنانی ئامانج و مەبەستە سیاسیەکان و لە کاتی پێویستدا بەکاربهێنرێن.

## دووەم:- ڕای گشتی جیهانی

ڕای گشتی جیهانی بریتی یە لەو هەست و سۆزە باوەی (الشعور السائدة) کە لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا لە بەرامبەر کێشە گرنگ و ڕووداوە سیاسیە دیاری کراوەکاندا دەردەکەوێت، بە واتایەکی تر، بریتی یە لە کاردانەوەی هەست و سۆزی گشتی گەلانی جیهان لەمەڕ ڕەفتاری سیاسی یەکەیەکی سیاسی دیاری کراودا، بە تایبەت دەوڵەت، جا لە ناوخۆی سنورەکەیدا بێت (واتە لە دژی گەلەکەی خۆی ڕەفتار بکات) یان لە دەرەوەیدا بێت (واتە لە دژی گەلانی تر ڕەفتار بکات)[٢٤].

پاش ئەو پێشکەوتنە زۆرەی لە هۆیەکانی پەیوەندی کردن و میدیاکاندا بەرجەستە بووە بە شێوەیەك کە شۆڕشی تەکنۆلۆجی کات و شوێنی نزیك کردووەتەوە، بەجۆرێك کە تاکەکان ڕۆژانە و بگرە سات لەدوای سات ئاگایان لە ڕووداو و کێشەکان بێت و بەردەوام لە گەڵیدا کارلێك بکەن و هەڵسەنگاندن و بەدوادا چونیان بۆیان هەبێت، بە تایبەت لە کێشە گرنگ و چارەنوس سازەکاندا، هەموو ئەمانە وای کردووە ڕای گشتی جیهانی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هۆشیار تر بێت و هەنگاوی زیاتر بنێت و ڕێژەیی یانە ڕوو لەزیاد بوون بکات.

هەنوکە ڕەگەزەکانی ڕای گشتی جیهانی زیادیان کردووە لە هەموو کەرتە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوریەکاندا، گرنگترینیشیان لەمانەدا خۆیان

دەبیننـەوە ((حیزبـە سیاسـیەکان، ڕێکخراوەکـان‌و ئـەو (کۆمەڵـە)انـەی کـە گرنگیـەکی نێودەوڵـەتیان هەیـەو گرنگـی بـە کێشـە نێودەوڵەتیـەکان دەدەن‌و لێکۆڵینەوەو چالاکیەکانیان جێی ڕێزو حساب بۆ کردنن لە لایەن ناوەندە نێودەوڵەتی‌یەکانـەوە، هـەروەها ڕۆژنامـەکان، بـە تایبـەت ئـەو ڕۆژنامانـەی کـە کاریگەریـەکی فراوانیـان لەسـەر هـزرو بـڕواو قەناعـەتی خوێنـەرانی هەیـە، هـەروەها دامودەزگـا بـەرفراوان‌و بەناوبانگـەکانی هـەواڵ‌و ڕادیۆکـان‌و کەناڵـەکانی تەلـەفزیۆن. [٢٥] ئەمە جگـە لـە تـۆڕی ئەنتـەرنێت کـە بـە نوێـترین‌و دیموکراتی ترین بەرهەمی ئەم سەردەمە لە قەڵەم دەدرێت.

سەبارەت بە ڕۆڵـی ئـەم فاکتـەرە لەسـەر بڕیـار بەدەسـتان ڕای جیـاوازو جۆراو جۆر هەیە، هـەندێك پێیـان وایە ڕای گشـتی جیهانی کاریگەری‌یـەکی کاراو بەهێزی هەیە، چونکە ڕای گشـتی جیهانی لـە پشـت پـرۆژە جیهانی‌یە گرنگەکانی وەك ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوەیە. لـە بەرامبـەردا چەند ڕایەکی تر هەیە کە نکۆڵی لە ڕۆڵ‌و کاریگەری ئەم فاکتەرە دەکەن بە تەواوی، چونکە ئەم فاکتەرە نەیتوانیوەو ناتوانێت بەر بە داگیرکاری دەوڵەتان بگرێت. لە پاڵ ئەم دوو ئاڕاستەیەدا ڕای سێهەم هەیە کە دەڵێت: کاریگـەری ڕای گشـتی نێودەوڵەتی بەپێی بارودۆخ‌و هەلومەرجە نێودەوڵەتیـەکان دیـاری دەکرێـت، لـە هەندێك کاتدا ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەو ئیجابی دەگێڕێت، بە ئاڕاستەیەکدا کە پاڵ بە دەوڵەتانەوە بنێت بۆ ئـەوەی بە ئاڕاسـتەی خواسـتەکانیدا بـڕوات. بـەڵام لـە هـەندێك کاتی تـردا ڕۆڵ‌و کاریگەریەکـەی کـەمتر دەردەکـەوێت[٢٦])) بە بۆچوونـی ئێمـە ئـەم ڕایـە لـە ڕاسـتی‌و واقعیشـەوە نزیکـترە، ئـەم کاریگەرێتی‌یـەش لـە وڵاتێکـەوە بۆ وڵاتێکـی تـرو لـە کێشـەیەکەوە بۆ کێشـەیەکی تـر دەگۆڕێـت، وە دەکرێت بڵێین گرنگی‌و ناگرنگی ئەو بابەتـەی ڕای گشـتی هەڵوێسـتی لەمـەڕدا دەنوێنێت ڕێژەی حساب بۆ کردنی بڕیار بەدەست بۆ ئەو ڕای گشتییە دیاری دەکات، کەواتە پەیوەندییەکی پێچەوانە هەیە لەنێوان گرنگی بابەتی هەڵوێست لەمەڕ وەرگیراوو ڕێژەی گرنگیدانی بڕیاربەدەست بەڕای گشتی جیهانی. لـەم بوارەشدا کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بـە هـەموو جۆرەکـانی نوسـراو و خوێنـدراو و بینراو و نێرراوەوە ڕۆڵێکی بالا دەبینن، بۆ نموونە میدیا ڕۆژئاوایی‌یەکان بـە هـەموو شـێوازەکانیەوە لـە خزمـەتی بـەرژەوەندی دەوڵەتـەکانیان لەمـەڕ کێشـە گرنگ‌و هەستیارەکاندا کار دەکـەن، وە لەبـەر زۆری‌و هەمـەجۆری‌و چـاکی ئـەم هۆکارو میکانیزمانەوە ئەو وڵاتانە دەتوانن ڕای گشتی جیهانی بەلای خۆیان دا

رابكێشن لەمەڕ هەر كێشەو قەیرانێكدا كە بە شێوەیەك كە بەرژەوەندی خۆیانی تێدا بێت، واتە لایەنە بەهێزەكان (زلهێزەكان). بەڵام وولاتە تازە پێگەیشتووەكان توانای ڕاكێشانی ڕای گشتی جیهانی‌یان بەلای خۆیاندا لاوازە.

لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بكەین كە ئەم هاوكێشەیەی سەرەوە ڕەهانیە، بەڵكو ڕێژەیی‌یە، چونكە هەندێك كێشەی گرنگ‌و هەستیار هەیە كە نكوڵی لێ ناكرێت‌و بە شێوەیەكی جەوهەری‌و ڕەها پێشێلی بنەما مرۆیی‌و ئەخلاقیە نێودەوڵەتیەكانی تێدا بەدی دەكرێت‌و سۆزی گەلان دەجوڵێنێت، جا ئەو دەوڵەتەی بڕیاری پەیوەندی‌دار بەم كێشانە دەردەكات بەهێز بێت یان لاواز.

لە كۆتاییدا دەتوانرێت بوترێت ڕای گشتی جیهانی لەگەڵ ئەو كاریگەرییە جۆراو جۆرەی هەیەتی لەسەر بڕیار بەدەستان لە هەموو وولاتاندا، وە لەگەڵ ئەوەی كە بە لەمپەرێك لەبەردەم بڕیار بەدەستاندا دادەنرێت، جگە لەوەی یەكێك بێت لە فاكتەرە كاریگەرە نێودەوڵەتیەكان لەسەر ڕەفتاری دەوڵەتان‌و خاوكردنەوەی هەنگاو نانیان بەشێوەیەكی كرداری‌و خێرا شتێكی تر نیە. نموونەی زیندوی ئەم ووتەیەش هەنوكە لەسەر گۆڕەپانی سیاسیدا دیارە (وەك ئەو خۆپیشاندانە ملیۆنی‌و هەزاری‌یانەی لەمەڕ ڕوودانی جەنگی ئەمەریكی - بەریتانی دژ بە عێراق ساز كرا لە وولاتانی جیاجیادا پێش جەنگەكە).

وەك دەرەنجامێك بۆ هەموو فاكتەرە نێوخۆیی‌و دەرەكیەكان دەتوانرێت بوترێت كاتێك بڕیار بەدەست دەیەوێت ئامانجگەلێك بەدی بهێنێت پێویستە لەژێر ڕۆشنایی ئەم فاكتەرانەدا پرۆسەی دروستكردنی بڕیار ئەنجام بدات، جا فاكتەرەكان جێگیربن یان ناجێگیر یان نیمچە جێگیر. ئەمەش دوای تێگەیشتن‌و لێكدانەوەو هەڵسەنگاندنی ئەو فاكتەرانە لەلایەن بڕیار بەدەستانەوە.

لێرەدا توانای هەڵسەنگاندن‌و تێگەیشتن‌و پێشبینی كردن‌و هەڵبژاردنی هۆشیارانەی بڕیار بەدەست دەردەكەوێت. بەم شێوەیە ڕوون دەبێتەوە كە خاوەن بڕیار سەربەخۆی ڕەها نیە لە هەڵبژاردنی جێگرەوەكان‌و دیاری كردنی باشترینیاندا، بەڵكو چەندین كۆت‌و فاكتەر دەوریان داوە كە چوارچێوەیەكی سنورداری بۆ دیاری دەكەن. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێت كە بۆ دواجار بڕیار لەدەستی خاوەن بڕیاردایە، كەواتە پێویستە ڕۆڵی فاكتەری سەركردە لە پرۆسەی دروستكردنی بڕیاردا لەیاد نەكەین...

# پەراویزەکانی بەشی دووەم

(١) عماد خلف يوسف، سياسة العراق الخارجية تجاه أمن الخليج العربي ١٩٦٨-١٩٨٨، جامعة المستنصرية، بغداد، رسالة ماجستير ١٩٩٠، ص٨٦.

(٢) انظر: د. وليد حمدي الاعظمي، مصدر سبق ذكره، ص٨٩، وانظر ايضا: د. محمد السيد سليم، مصدر سبق ذكره، ص١٣٨.

(٣) د. فاضل محمد زكي، مصدر سبق ذكره، ٦٦-٦٨.

(٤) د. وليد جنسن، مصدر سبق ذكره، ص٣٠٢-٣٠٨.

(٥) هاني الياس خضر الحديثي، مصدر سبق ذكره، ص٥٥.

(٦) د. ضرغام عبدالله الدباغ، مصدر سبق ذكره، ص٩٩-١٠٠.

(٧) د. لويد جنسن، مصدر سبق ذكره، ص٢٩١. وانظر: د. عبدالقادر محمد فهمي، النظام السياسي الدولي دراسة في الاصول النظرية والخصائص المعاصرة، دار وائل، عمان، الطبعة الأولى، ١٩٩٧، ص٥٩-٧٣.

(٨) د. مازن اسماعيل الرمضاني، الأمن القومي العربي والصراع الدولي، مجلة العلوم السياسية، كلية العلوم السياسية بجامعة بغداد، السنة الأولى، العدد٢، تموز ١٩٨٨، ص٦٨.

(٩) د. حسن حمدان العلكيم، صنع القرار الخارجي السعودي، المجلة العربية للعلوم السياسية، الجمعيةالعربية للعلوم السياسية، العدد ٧ تشرين الثاني (نوفمبر) ١٩٩٢، ص٦٨.

(١٠) د. مازن اسماعيل الرمضاني، في عملية اتخاذ القرار السياسي الخارجي، مصدر سبق ذكره، ص١٤٣.

(١١) د. مهدي جابر مهدي، القانون الدولي العام، محاضرات القاها على طلبة الصف الثالث في كلية القانون والسياسة، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠١.

(١٢) د. مازن اسماعيل الرمضاني، السياسة الخارجية، مصدر سبق ذكره، ص٢٧١-٢٧٣.

(١٣) انظر اقبال حسون القزويني، المنظمات غير الحكومية ودورها في بناء المجتمع المدني، معهد العراق للإصلاحات والثقافة الديمقراطية، سيمنار (التعاون الاقليمي الدمقرطة) اربيل، مايس، آيار، ٢٠٠١، ص٧-١٠.

(١٤) د. مهدي جابر مهدي، التطورات السياسية في الشرق الأوسط، مصدر سبق ذكره.

(١٥) د. اراس دارتاش، العلاقات الدولية، محاضرات القاها على طلبة المرحلة الثانية بقسم الصحافة، المعهد الفني، السليمانية ٢٠٠٢، وانظر ايضا، د. حسن حنفي و د. صادق جلال العظم، ما العولمة، دار الفكر، دمشق، الطبعة الثانية ٢٠٠٠، ص٣٠٨.

(١٦) د. مازن اسماعيل الرمضاني، السياسة الخارجية مصدر سبق ذكره، ص٢٧٥-٢٧٧.

(١٧) مارسيل ميرل، سوسيولوجيا العلاقات الدولية، ترجمة: د. حسن نافعة، دار المستقبل العربي، بيروت، القاهرة، الطبعة الأولى، ١٩٨٦، ص٤٢٠.

(١٨) جوزف سماحة، عصر العولمة: كون مفتوح بلا ضوابط، مجلة الوسط العدد ٤١٦- ٢٠٠١/١/١٧.

(١٩) د. عبدالقادر محمد فهمي، النظام السياسي الدولي، مصدر سبق ذكره. ص٥٠

(٢٠) محسن الموسوي، القرن الواحد والعشرون والبحث عن الهوية، دار الهادي، بيروت، ١٩٩٢، ص٩٦-٩٧.

(٢١) د. مازن اسماعيل الرمضاني، السياسة الخارجية، مصدر سبق ذكره، ص٢٨٢.

(٢٢) د. ضرغام عبدالله الدباغ، مصدر سبق ذكره، ص١٠١-١٠٢.

(٢٣) د. فاضل زكي محمد، مصدر سبق ذكره، ص٦٨.

(٢٤) د. روبرت ود. كانتور، مصدر سبق ذكره، ص٥٢٨، وانظر ايضا: مصطفى ابراهيم، مصدر سبق ذكره، ص٧٦.

(٢٥) د. ضرغام عبدالله الدباغ، مصدر سبق ذكره، ص١٠٠.

(٢٦) د. مازن اسماعيل الرمضاني، السياسة الخارجية مصدر سبق ذكره، ص٢٩١.

# بەشی سێهەم

## قۆناغەکانی پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی

پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی بە یەکێك لە دژوارترین قۆناغەکان دەژمێردرێت لە چوارچێوەی پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی‌و پارێزگاری بەرژەوەندیە نەتەوەییە بالاکاندا، هەر بۆیە بە پرۆسەیەکی ئالۆزو فرە ڕەهەندو لایەن دەژمێردرێت، هەروەها پرۆسەیەکی بەردەوامە بۆ ڕۆیشتن بە هاوشانیی ڕووداوەکان‌و چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانەی کە یەکە نێودەوڵەتیەکان لە سایەی گۆڕانکاری‌و پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکاندا ڕووبەڕوویان دەبنەوە.

قسەکردن لەسەر بابەتێکی ئاوا ئالۆز کارێکی ئاسان نیەو پێویستی بە ڕوونکردنەوەو ڕاقە کردنی زۆر هەیە، چونکە ئەم پرۆسەیە دەکەوێتە ژێر کاریگەری چەندین فاکتەرەوەو بە چەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت کە هەریەکەیان لەوی دی جیاوازەو لێکنەچووە، لە هەمان کاتدا هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیاندا کارلێك دەکەن. ئێمە لێرەدا بەم شێوەیە قۆناغەکانی ڕیزبەند دەکەین.

### یەکەم:- پێناسەو دیاری کردنی هەڵوێست

پێناسە کردنی هەڵوێست بە یەکەمین قۆناغی پرۆسەی دروستکردنی بڕیار دادەنرێت، بۆ نموونە: باری ئاسایی ناوخۆ لە دەوڵەتێکدا، یان هەوڵی ئەو دەوڵەتە (یان کۆمەڵە دەوڵەتێك) بۆ بەدی هێنانی ئامانجە سیاسیە دەرەکیە تایبەتیەکانی، هەڵوێستێك لای دەوڵەتێکی تر (یان چەند دەوڵەتێکی تر) دروست دەکات، کە دەبێتە گرفتێکی فرە ڕەهەندی جیاواز کە پێویستی بە چارەسەر بێت، لەبەر ئەوەی ئەو هەڵوێستەی کە پەیوەندی بە کێشەیەکەوە هەیە وا دەخوازێت دەوڵەتی بەرامبەر وەڵامدانەوە (یان بێ دەنگ بوون)ی لە بەرامبەردا بنوێنێت، بۆیە هەر لە سەرەتاوە بڕیار بەدەست هەوڵی دیاری کردن‌و هەڵسەنگاندنی ئاستی کاریگەرێتی ئەو بارودۆخە دەدات لەسەر بەرژەوەندی دەوڵەتەکەی[1]. بەم شێوەیە بڕیار بەدەست

هەڵوێستی دەوڵەتەکەی دیاری دەکات لەمەڕ کێشە نێودەوڵەتیەکاندا کە زۆر جار پاڵنەرێکی دەرەکی دەبێتە هۆی دروست بوونی ئەو هەڵوێستانە.

لەم میانەیەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هەموو هەڵوێستێك لە دوو لایەن پێك دێت کە لە ڕووی سروشتەوە بە تەواوی لە یەکدی جیان:-

یەکەمیان: لایەنی کارو سازدان (التعبوی operational) دەگرێتەوە، واتە هەڵوێستەکە هەروەك خۆی لە واقیعدا.

بەڵام دووەمیان: لایەنی دەروونی‌یە (psychological)، واتە هەڵوێستەکە وەك چۆن لە لایەن بڕیار بەدەستەوە دەفامرێ‌و لێکدەدرێتەوە[٢]، کەواتە ناسین‌و هەست کردن‌و تێگەیشتنی بڕیار بەدەست بەشێك لە قۆناغی ناساندن‌و دیاری کردنی هەڵوێست پێك دەهێنێت.

لە ڕێی پرۆسەی سەرنج دان‌و تێبینی کردنەوە بە هەستەکان (Senses) کە لە کەسی سەرنجدەرو شتی سەرنجدراو – هەڵوێست – و ژینگەی دەوروبەری‌و ئەو بارو دۆخ‌و کارتێکەرانەشی کە دەیگرێتە خۆ پێك دێت، پرۆسەی سەرنجدانەکە ئەنجام دەدرێت[٣].

کەواتە سەرنج دان‌و تێگەیشتن بریتی نی‌یە لە ناسینی واقیع، بەڵکو وەرگێڕانێکی لۆژیکی‌یە لەسەر بنەمای مەعریفی‌و بەهاکان، بۆ ئەو واقیعە، بەرەو دیدێك کە ڕەفتارو ڕێڕەوەکەیشی لە ڕووی بەرامبەردا دیاری بکات[٤].

ئەم پرۆسەیەش پرۆسەیەکی فرە لایەنە، بە دەستەواژەیەکی تر، دەکەوێتە ژێر کاریگەری چەندین فاکتەرەوە، لەوانە فاکتەرە بابەتی‌و کۆمەڵایەتی‌و دەرونیەکان‌و ئەزموون‌و شارەزایی پێشینەی بڕیار بەدەست. بۆیە بڕیار بەدەست بۆ ئەوەی بڕیارەکانی گونجاو بێت‌و لە ئاستی پڕکردنەوەی پێویستیەکاندا بێت، پێویستە پێش هەموو شتێك سەرنج‌و تێگەیشتنی بۆ هەڵوێستەکان هەبێت بەو شێوەیەی کە بە کردەوە لە واقیعدا بوونیان هەیە، نەك بەو شێوەیەی خۆی دەیبینێت، چونکە ئەمە سەر دەکێشێت بۆ ئەوەی لە بڕیارداندا بکەوێتە هەڵەوە، لەمەشەوە پەیڕەوی ڕەفتارێك دەکات کە لە ئاستی پێویستیەکاندا نەبێت بڕیار بەدەست زانیاری تەواوی لەبەر دەستدا بێت، چونکە زانیاری تەواو کارێکی گرنگ بە ئەنجام دەگەیەنێت ئەویش ڕێنموویی کردنی بڕیاری سیاسیە کە بڕیار بەدەستان هەموو کاتێ پێویستیان پێ‌یەتی، ئەگەر چاوێکیش بە مێژوودا بخشێنینەوە، دەبینین

نموونەی ئەو بڕیارە وێرانکەرانەی کە دەرەنجامی هەڵەی مەترسیدار بوون لە زانیاریدا وای لێهاتووە لە ژماردن نایەت.

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە یەکێك لە ڕەگەزە جەوهەرییەکانی ڕاگەیاندن بریتییە لە ناسینی ویستی دوژمن لە بەکارهێنانی هێزەکانیدا[5] یاخود هەر کارێکی دی کە پێی هەڵدەستێت، بۆ نموونە: لە کاتێکدا دەوڵەتی (أ) هێزێکی سەربازی زۆر لەسەر سنوری دەوڵەتی (ب)دا کۆ دەکاتەوە، یاخود مانۆڕێکی سەربازی ئەنجام دەدات، کە خۆی لە خۆیدا چەند ڕەمزو مەبەستێکی لەخۆ گرتووەو مەبەست تێیدا چەند لایەنێکە، جا ئەگەر دەوڵەتی (ب) زانیاری تەواو و ڕاستی لەبەر دەستدا بێت سەبارەت بە ویستو مەبەستەکانی دەوڵەتی (أ) ئەوا هەڵوێستی ڕاستو دروست وەردەگرێت وە گەرنا بە پێچەوانەوە، کە زۆرجار شکستی گەورەی بەدوادا دێت، مێژووش شایەتحاڵی لەو بارەیەوەی زۆرە.

بەم شێوەیە بۆمان ڕوون بۆوە کە کاری دەزگا هەواڵگرییەکان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری چەند مەترسیدارە. لەمیانەی ئەمانەشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پرۆسەی سەرنج دانو تێگەیشتن بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێت[6]:-

- هاتنی زانیارییەکان بۆ بڕیار بەدەست کە پاڵی پێوەبنێت بۆ دەرکردنی هەر بڕیارێك بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هەڵوێستەکان.
- گەڕانەوەی بڕیار بەدەست بۆ ئەو زانیاریو بیرو بۆچوونانەی کە گەنجینەی بیرەوەریەکانیدا دایناوە لەمەڕ هەڵوێستەکاندا.
- بەراورد کردنی بڕیار بەدەست لەنێوان زانیاریە نوێیەکانو ئەو بۆچوونو واتایانەی کە لە گەنجینەی بیرەوەرییەکانیدا هەیە.
- دروستکردنی تێگەیشتنێکی نوێ بۆ هەڵوێستەکان.

لێرەوە گرنگی زانیاریەکانمان بۆ دەردەکەوێت کە کاریگەریان هەیە لەسەر چۆنێتی تێگەیشتنی بڕیار بەدەست بۆ حەقیقەتی هەڵوێستەکان، وە لەسەر ئەم بنچینەیەوە پێویستە بڕیار بەدەست بە وریاییو زیرەکانە سەرنجی ئەو زانیاریانە بدات کە دەچنە بەردەستی، چونکە جۆری زانیاریەکان کاریگەری هەیە لەسەر چۆنێتی تێگەیشتنی ئەو بۆ بارودۆخەکان، ئەمەش کاردەکاتە سەر سەرکەوتن یان شکست هێنانی

بڕیارەکە. جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بدەین کە وردیو خێرایی گەیشتنی زانیاری‌یەکان بۆ ناوەندی بڕیار بەندە بە چۆنێتیو سروشتی تۆڕی ئەو پەیوەندیانەی کە لە نێوان ناوەندی بڕیار لە لایەكو لایەنەکانی تۆڕی پەیوەندیەکان لە لایەکی ترەوە هەیە.

لە ڕۆشنایی کارلێکی ئەو فاکتەرانەی ڕێکخستن کە پەیوەندیان بە تۆڕی پەیوەندیەکانەوە هەیە، هەروەها ئەو فاکتەرە دەرونیانەش کە پەیوەندیان بەکۆی ئەو فاکتەرو ڕەچاوکردنە خۆیەکیانەی (الاعتبارات الذاتیة) تایبەتن بە بڕیار بەدەستەوە کە کاریگەریان لەسەر قۆناغی ناساندنو دیاری کردنی هەڵوێست هەیە، دەتوانین بڵێین ئەم قۆناغە بە سێ قۆناغی لاوەکیدا تێدەپەڕێت کە پێکەوە بەستراون[7]:-

١- پەی بردن (الادراك)
٢- هزرکردن (تێڕوانین).
٣- هەڵسەنگاندن.

کە تێگەیشتن سەر دەکێشێت بۆ دروستکردنی شێوەیەکی خودی بۆ سروشتو واتای هەڵوێستێکی سیاسی دەرەکی، ئەم ((شێوە))یەش دەکرێتە بنچینەیەك بۆ هەڵسەنگاندنی ئاستی توانا خۆیەتی‌یەکانی دەوڵەتێك بۆ وەڵامدانەوەی داخوازیو پێویستیەکانی ژینگەی دەرەکی، واتە ئەو شێوەیە (الصورة) بەکاردەهێنرێت بۆ هەڵوێست هەڵسەنگاندنو دەرەنجامی هەڵسەنگاندنەکەش لە کۆتاییدا کار لە جۆرو چۆنێتی مامەڵەی داهاتووی بڕیار بەدەست دەکات.

داڕشتنی هەڵوێستێکی سیاسی دروستو کاریگەر کارێکی ئاسان نیە وەك بۆ هەندێك وا دەردەکەوێت، لەم میانەیەدا دروستکەری بڕیار چەندین ڕەگەزو ڕەهەندو ئیعتبار لەبەردەمیدا هەیە، کە پێویستە لە هەمان کاتدا ڕەچاویان بکات. ئەم ڕەگەزانەش لەمانەدا خۆی دەبینێتەوە:-

بنەوێیی (المبدئیة)، جیاوازکاری (هاوێرکردن)، ڕوونو ئاشکرایەتی، دەست پێشخەری، بەکرداری بوون، قابیلیەتی پێشخستنو گشتگیربوون، دەرخستنی گرنگترین ڕەهەند، گونجان لەگەڵ هەڵوێستەکانی تردا، تەنگ پێ هەڵچنینو سەغڵەت کردنی دوژمن، هۆشیار کردنی جەماوەر، هەروەها هاوسەنگی کردن لە نێوان ئیعتیبارە ستراتیجیو مەودا کورتەکاندا.[8]

لە ڕاستیدا پرۆسەی هاوسەنگ کردنو سازدان لە نێوان ئەم ڕەگەزانەدا بۆ داڕشتنی هەڵوێستێکی سیاسی دروست کارێکی ئاسان نیە، کارێکی ئاوها پێویستی بە دیاری کردنو ڕیزبەندییەکەمایەتی (الأولويات)و دیاری کردنی ئەو بابەتانەی دەگونجێت سازشی لەسەر بکرێتو ئەوانەش کە ناگونجێت، و کامیشیان شیاوی دواخستنە.

لە ڕۆشنایی هەموو ئەمانەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەم قۆناغە زۆر وردو هەستیارەو پێویستە بڕیار بەدەست زانیاری تەواو و ڕاستی بە وردیو خێرایی بگاتە دەست، هەروەك چۆن پێویستە هەوڵ بدات ڕاستییەکان وەك خۆی لەواقیعدا چۆنە ئاوها ببینێت بۆ ئەوەی نەکەوێتە هەڵەیەکەوە کە گەلو وڵاتەکەی پەلکێشی کارەساتو قەیران بکات بە جۆرێك باجەکەی بە نەوەکانی داهاتووشی نەدرێتەوە، مێژووش پڕیەتی لە حاڵەتی وا، کاتێك سەرکردە حەزو ئارەزووەکانیو دیدو بۆچوونێکی دۆگماو ڕای شۆفێنی کردە پێوەر بۆ هەڵسەنگاندنی هەلومەرجو بارودۆخەکان حسابی بۆ شیکردنەوە بابەتیەکان نەکرد، شتێکی ئاشکرایە کە گەلو نیشتمانەکەشی بەرەو هەڵدێر دەبات.

ماوەتەوە ئامارە بەوە بدەین کە کاتێك هەڵوێست سەر هەڵدەدات کاری ئیحتیوا کردنی کاریگەرییە نێگەتیڤەکان دەبێتە پێویستیەك کە لە ڕێگەی دیاری کردنی جۆری وەڵام دانەوە بە شێوەیەکی پێش وەخت دەبێت، ئەمەش بە دانانی نەخشەو بەرنامەی پێشخستنی بەرژەوەندیە نیشتمانیو نەتەوەیییەکان دەبێت.[٩]

## دووەم:- دیاری کردنی ئامانج

ئامانجی سیاسی دەرەکی هەروەك ((اسماعيل صبري مقلد)) پێناسەی دەکات: ((بارێکی دیاریکراوە لەگەڵ بوونی وێستو ئارەزووی تەواو بۆ جێبەجێ کردنی لە ڕێگەی تایبەت کردنی بڕی پێویست لەو کۆششو توانایانەی پێویستن بۆ گواستنەوەی ئەو بارە لە قۆناغی پێشکەوتنی تیۆری ڕووتەوە بۆ قۆناغی جێبەجێ کردنو هێنانەدی ماددی.[١٠]

کەواتە پێویستە لەسەر بڕیار بەدەست ئامانجی خوازراوی خۆی دیاری بکات پاش ئەوەی هەڵوێستەکەی هەڵدەسەنگێنێت لە پێش ڕەفتارکردنیدا،

لەم دیاری کردنەشدا، سنایدەر پێی وایە چوار فاکتەر کاریگەریان لەسەر بڕیار بەدەست دەبێت:-

١- ئەو ئامانجو مەبەستانەی بەدی هێنانیان خوازراو و ویستراو و پێویستن.

٢- پەیوەندی ئەم جۆرە ئامانجانە لەگەڵ ئامانجەکانی تردا.

٣- ئەو دەرەنجامانەی لێی دەکەوێتەوە.

٤- کاتی گونجاو بۆ بەدی هێنانیان، زیاد لەمانەش بڕیار بەدەست چەند فاکتەرێکی تر لە بنەڕەتەوە کاریگەرییان لەسەری دەبێت، وەك: ئاوات و پێویستیە کۆمەڵایەتیە سەرەکیەکانی ژینگەی ناوخۆییو شیکردنەوەی بڕیار بەدەست بۆیانو ئاستی گرنگی هەریەکەیان لە ئاست ئەوانی تردا، ئەمانە لە لایەكو کاریگەری سروشتی هەلومەرجی سیاسی نێودەوڵەتی لە لایەکی دیکە.[11]

لەگەڵ ئەو پۆلێنانەی کە بۆ ئامانجە سیاسیە دەرەکیەکان کراونو جیاوازیان لە پۆلێنێکەوە بۆ یەکێکی دی، دەتوانرێت لە چەند خاڵێکدا ئەم ئامانجانە بە شێوەیەکی گشتی کۆبکرێتەوە، وەك: هەوڵدان بۆ زیادکردنی هێزی نەتەوەی، یان پاڵپشت کردنی قەوارەی هەرێمی، یان برەودان بە دەسەلاتڕۆیی نێودەوڵەتی، یاخود ئامانجە ئابووریو ئایدۆلۆجیەکانو .....هتد، وە یەکێك لەو خاڵانەش کە هەموو لایەك کۆکن لەسەری ئەوەیە کە ئاسایشینەتەوەیی لە سەروو هەموو ئامانجەکانەوەیە.[12]

لێرەوە ڕۆڵی بڕیار بەدەست دەردەکەوێت کاتێك ئەو دیدو تێگەیشتنو ڕاڤەکردنی بۆ ئاسایشی نەتەوەییو بەرژەوەندیە نەتەوەیییەکان دەبێت لەژێر فشاری چەندین فاکتەردا، پێویستە لەسەری جەخت بخاتە سەر بەدی هێنانی ئامانجەکانی دەوڵەتەکەیو بەرژەوەندیەکانی، ئەمە لەگەڵ گرنگی دان بە ئامانجەکان بەپێی ڕێژەی گرنگیەکانیان لە سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتەکەیدا.

لە بواری هەڵسەنگاندنی ئامانجەکانو ڕیزبەندکردنیان لە چوارچێوەیەکی یەکەمینایەتی دیاری کراودا چەند پێوەرێك هەیە، یەکەم پێوەر بریتییە لە بوونی ویستو ئارەزووە لەسەر ئامانجەکە، و پێوەری دووەمیش پەیوەستە بەوەوە کە ئایا ئامانجەکە ڕەخسارە یان نەء؟ پێوەری سێهەمیش پەیوەستە

بە فاکتەری تواناکانی دەوڵەت کە هەیەتی و تا چەندێك توانای بەدی هێنانی ئامانجەکە دەکات.[١٣] واتە ئایا ئەو ووزەو توانایانەی دەوڵەت هەیەتی بەشی بەدی هێنانی ئەو ئامانجە دەکات کە بڕیار بەدەست پێویستیەتی بۆ بەدی هێنان و جێبەجێ کردنی بڕیارێك کە بۆ بەدەست هێنانی ئامانجێکی خوازراو و ڕەخساو پێویستە هەبێت.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بڕیار بەدەست پێویستە لە دیاری کردنی ئامانجەکاندا تواناکانی دەوڵەتەکەی ڕەچاو بکات و پلەبەندی لەبەرچاو بگرێت بۆ ڕیزبەند کردنی ئەو ئامانجانە بە پێی یەکەمایەتی و گرنگیەکانیان، بۆ ئەوەی جێبەجێ کردن و بەدیهێنانی ئامانجێك یان چەند ئامانجێکی دیاری کراو سەر نەکێشێت بۆ لەناو چوون یان بەفیڕۆدانی چەندین ئامانجی گرنگتر لەوانی پێشوو.

بۆ نموونە کاتێك سەرکردە بڕیاری بە بەرپاکردنی جەنگ دەدات، گەر لە هاوسەنگ کردنی هاوکێشەکاندا حساب بۆ ڕەهەندەکانی تر نەکات، ئەوا وولات و نیشتمان و ئابوری و بەڕێوەبردنی وولاتەکەیشی زۆرجار تووشی وەستان یاخود شکست و زیانێکی زۆر دێن و شوێن و دەسەلاتی وولاتەکەشی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی کەم دەکاتەوەو لەسەر ئاستی ناوخۆش کێشەو ئاژاوەو شێواندنی ئاسایش دەبێتە کارێکی ئاسایی ڕۆژانە، ئەمە جگە لەو زیانە گیانی و ماڵی یانەی کە لە وولات و گەلەکەی دەکەوێت.

### سێهەم:- دیاریکردنی جێگرەوەکان و هەڵسەنگاندنیان

پاش ئەوەی بڕیار بەدەست ئامانجی ڕەفتاری داهاتووی دیاری کرد، قۆناغی هەڵبژاردنی جێگرەوەکان (البدائل Alternatives) دێت، کە بە واتای حەصرکردن و دیاری کردنی ئەگەرە گونجاوو ڕەخساوەکان دێت لەسەر بنچینەی ئەو زانیاریانەی سەبارەت بە بابەتەکە لەبەر دەستدایە[١٤]. بە گشتی ئەم قۆناغە بە ئالۆزو نائاشکرا وەسف دەکرێت، ئەمەش لە دەرەنجامی چەند کارتێکەرێکی جیاجیاوە.[١٥]

ئەو جێگرەوانەش کە بڕیار بەدەست هەڵیان دەبژێرێت لە دیدی بڕیار بەدەست خۆیدا بە باش و گونجاو دادەنرێن، ئیتر مەرج نیە لە واقیعدا بەو شێوەیە باش و گونجاو بن. بۆ نموونە: کاتێك بڕیار بەدەست یەکێك لە جێگرەوەکان پەسەند بکات کە بریتی بێت لە بەستنی پەیماننامەیەکی

بازرگانی که پەیوەندی بە کەل‌وپەلی سەربازیەوە هەبێت لەگەڵ دەوڵەتێکی تردا، ئەوا ئەم هەڵسەنگاندنە لە دیدو بۆچوونی بڕیار بەدەست خۆیەوە دیاری دەکرێت، دیارە ئەم هەڵسەنگاندنەش لە بیرمان نەچێت لەژێر چەندین فشارو کاریگەریدا ئەنجام دەدرێت.

ئەم قۆناغە مەبەستمان پێی گەڕانە بەدوای سیغەیەك (یان چەند سیغەیەك)ی تایبەتدا کە بتوانێت چارەسەری ئەو کێشانە بکات، کە لە ئەنجامی هەڵوێستێکی سیاسی دەرەکی‌یەوە سەریان هەڵداوە، بە شێوەیەکی وا کە ئامانجی خوازراوی دەوڵەتێك بەدی بهێنێت بە کەمترین زیان[١٦]. واتە هێنانە دی ئامانجەکە بەکەمترین تێچوون‌و کەمترین زیانی ماددی و مەعنەوی. هەر لێرەشەوە سیفەتی ئاڵۆزی‌و نائاشکرایی دەدرێتە پاڵ ئەم قۆناغە، سەپاندنی ئەم سیفەتەش بەسەریدا دەگەڕێتەوە بۆ فاکتەرگەلێك کە بریتین لە:-

## ١- زانیاریەکان:-

چەندێتی‌و چۆنێتی زانیاریەکانی بەردەستی بڕیار بەدەست کار لە دیاریکردنی جێگرەوەکان‌و هەڵسەنگاندنیان دەکات، سنایدەر پێی وایە کە چوار چێوەی پرۆژەی ئەو بڕیارە جێگرەوانەی کە لە یەکەی دەرکردنی بڕیاردا باسی لێوە دەکرێت سنوردارە، جا یان بەهۆی بەهاو ئاڕاستەکانی پێشنیار کەرانی بڕیارو جۆری شارەزایی پێشوویانەوەیە، یاخود بەهۆی جۆرو ئاستی تەواوەتی ئەو زانیاریانەوە دەبێت کە لەبەر دەستدایە، زانیاریەکانیش سێ ڕۆڵ دەبینن لەم پرۆسەی هەڵبژاردنەدا:-

*یەکەم: دۆزینەوەی جێگرەوەکان.*

*دووەم: شی‌کردنەوەی جێگرەوەکان.*

سێهەم‌و کۆتایی: ئەوەیە کە بڕیار بەدەست پشت بەست‌و بەو زانیاریانەی لەسەر هەر جیگرەوەیەك لەبەر دەستیدایە، دەتوانێت بەراورد لە نێوانیاندا بکات‌و دواتر حسابی ئەگەری سوودو چاکەی چاوەڕوان کراو یان ئەگەری زیان دەکات کە دەگونجێت تووشی ببێت لەو جێگرەوەیە کە هەڵی دەبژێرێت بە بەراورد لەگەڵ جێگرەوەکانی تردا[١٧]. کەواتە زانیاریەکان یارمەتی دەرێکی گرنگی بڕیار بەدەستن لەبەردەم کێشەو هەلومەرجە نێوخۆیی‌و نێودەوڵەتیەکاندا، ئەمەش بەوەی کە یارمەتی بڕیار بەدەست

دەدەن لە دۆزینەوەو شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی جێگرەوەکاندا بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی پێشهاتو هەلومەرجە نێودەوڵەتیەکان، واتە زانیاریەکان بە ڕێنموویی کەری بڕیار بەدەست دادەنرێت بۆ دیاری کردنی باشترین و گونجاوترین کەناڵ بۆ دۆزینەوەی چارەسەری ڕاست بۆ ئەوەی سیاسەتی دەرەکی وولاتەکەی بە ڕێڕەوێکی ڕاستو دروستدا بەرێت.

### ٢- کەسایەتی بڕیار بەدەست و ئەزموونەکانی پێشووی

کەسایەتی بڕیار بەدەست کۆمەڵێك فاکتەری دەرونی و کۆمەڵایەتیو ژینگەییو...هتد کاریگەریان هەیە لەسەری، لێرەشەوە تایبەتمەندییە بۆماوەییەکان و ڕۆشنبیریو بنەچەی کۆمەڵایەتیو ئەزموونە تایبەتیەکان و ئەحکامە کۆمەڵایەتیەکان کاریگەری خۆیان لەسەر ئەو بەجێ دەهێڵن. وە ئەو هەمیشە ئازاد نیە لە بڕیارەکاندا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونەکانی پێشوویو کاریگەری هێڵە پانەکانی سیاسەتەکەیەوە[١٨] کە ناتوانێت بە ئاسانی لێیان لابدات، هەروەك چۆن توانای ئەو بۆ شیکردنەوەو ئەنجامگریو پێشبینی و هەڵێنجان، هەموویان کار لە کەسایەتی بڕیاربەدەست دەکەن، دواتریش لەسەر هەڵبژاردنی ئەو بۆ باشترین جێگرەوە کاریگەریان بەجێدەهێڵن. کەواتە ئەو فاکتەرانەی کە پەیوەندیان بە کەسایەتی سەرکردەوە هەیە ڕۆڵی گرنگ دەگێڕن لە ئاڕاستەکردنی جۆری دیاری کردن و هەڵسەنگاندنی جێگرەوەکاندا، لێرەدا مەبەستمان لەو فاکتەرانە ژینگەی دەروونی و جۆری پەروەردەی سەرکردە بە منداڵی و ئەو چەمك و بیرو ڕاو بۆچوونانەیە کە لە هزری سەرکردەدا جێگەی خۆیان کردۆتەوە، هەروەها تایبەتمەندی سروشتە تایبەتیەکانی و جۆرو ڕێگەی گەیشتنی ئەو بە دەسەڵاتەکەی، ئەمانە هەمووی جۆری کەسایەتی بڕیار بەدەست دیاری دەکەن کە بەپێی گۆڕانیان کار لە ڕێڕەوی بڕیارو سیاسەتە دەرەکیەکانی دەوڵەتان دەکات.

### ٣- کاریگەریەکانی هەڵوێست

هەر هەڵوێستێك بەگشتی کۆمەڵێك فاکتەری ناوخۆییو دەرەکی دەوریان داوە بە گۆڕانی شوێن و کات ئەم فاکتەرانەش دەگۆڕێت. ئەم فاکتەرانە کار لە پرۆسەی هەڵبژاردن و دیاریکردنی جێگرەوەکان دەکەن لە ڕێگەی

کارتێکردنیانەوە لەسەر تێگەیشتنی بڕیار بەدەست بۆ هەڵوێستەکە[19].
هەروەك چۆن نەتوانینی بڕیار بەدەست بۆ دیاری کردنی هەڵوێستەکە بە وردی دەبێتە هۆی بەفیڕۆدانی ئەو کاتەی لەبەر دەمیدایە بۆ دیاریکردنی جێگرەوە گونجاوەکان بە وردی. هەروەها هەندێك جار فشاری کات (نەبوونی کاتی تەواو) لە هەندێك باردا سەردەکێشێت بۆ دیراسەنەکردنی هەموو ئەو ئەگەرانەی کە دەگونجێت بکرێنە بڕیارو بنەمای مامەڵەکردن، دواتر ئەم کەمی کاتە وادەکات تەنها کەمێك لە جێگرەوەکان دیراسە بکرێن و یەکسەر یەکێکیان هەڵبژێررێن، ئەمەش وەك قبوڵکردنی ئەو ڕووبەڕوو بونەوەیەی (التحدی) کە قەیران و تەنگژەیەك فەرزی دەکات، وەك چوونە ناو باری جەنگەوە یان قبوڵکردنی ئاشتی بەپێی مەرجی بەرامبەر[20]. کە ئەم حاڵەتانەش زۆرجار لە کاتی تەنگژەو قەیرانەکاندا ڕوودەدات کە کوتوپڕی و موجازەفەو کەمی کات و مەترسی بەرامبەریان تێدا بەدی دەکرێت.

### ٤- ئەگەرەکانی ئەنجامی بڕیارەکە

لێرەدا مەبەستمان لە دیراسەکردنی کاریگەری ئەگەرەکانی ئەنجامگەلی بڕیارە لەسەر ڕای گشتی ناوخۆو دەرەوە بە تایبەتی، لەبەر ئەوەی ئەم ئەنجامانە کاریگەری گرنگیان لەسەر سیاسەتی دەرەوە دەبێت.
بڕیار بەدەست کار لەسەر ئەوە دەکات کە جێگرەوەیەکی ئەوتۆ هەڵبژێرێت کەباشترین ئەنجامی ناوخۆیی لێبکەوێتەوە بە بەراورد لەگەڵ جێگرەوەکانی تردا[21]. واتە جۆرو چۆنێتی هەڵسەنگاندنی بڕیار بەدەست بۆ ئەنجامەکانی دوای بڕیارەکە لەناوخۆو دەرەوەدا دەبێتە ئاراستەکەرێکی تر بۆ دیاری کردن و هەڵسەنگاندنی جێگرەوەکان.
لێرەوە دەردەکەوێت کە بڕیار بەدەست تەنها هەڵبژاردنی جێگرەوەکان و دەرکردنی بڕیاری لەسەر نیە، بەڵکو پێویستە دیراسەی ئەگەری ئەنجامەکانی بڕیارەکەش پێش دەرکردنی بکات و بەکاری بهێنێت وەك بنچینەو ڕێ نیشاندەرێك بۆ هەڵبژاردنی باشترین جێگرەوەو دواتر دەرکردنی باشترین بڕیارو پەیڕەوکردنی باشترین سیاسەت لە ئاستی دەرەوەدا.

## ٥- یەکەی دەرکردنی بڕیار

یەکەی دەرکردنی بڕیاریش کاریگەری خۆی لەسەر دیاری کردنی جێگرەوەکان و هەڵسەنگاندنیشیان بەجێدەهێڵێت، ئەمەش لەوەدا دەردەکەوێت کە پرۆسەی هەڵبژاردنی جێگرەوەکان و گفتوگۆ کردن لەسەر ڕەهەندەکانی ووردتر دەبێت لەو یەکانەی بڕیار کە پەیوەندیەکی بەهێزی کارلێك کردن هەبێت لە نێوان ئەندامەکانیدا، کە پەیوەندیەك کە لە تێگەیشتنی هاوبەشەوە بۆ هەڵوێستەکە سەرچاوەی گرتبێت، بەڵام ئەو یەکانەی بڕیار کە پەیوەندیەکی بیرۆکراسیانە زاڵە بەسەر ئەندامەکانیدا، سنوری ئومارەسەکردنی مافی ئازادی گفتوگۆو کۆبوونەوەی ئەندامەکانیو کۆك بونیان لەسەر جێگرەوە پێشنیار کراوەکان تەسك دەبێتەوە.[٢٢]

لە ڕۆشنایی هەموو ئەمانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم قۆناغەش قۆناغێکی ئاڵۆزو ووردو گرانە، چونکە سەرکەوتن تێیدا لەسەر توانا خۆیەکیەکانی بڕیار بەدەست وەستاوە بۆ شیکردنەوەو ئەنجامگریو پێشبینی، هەروەك چۆن لەسەر بوونی زانیاری ووردو ڕاستو تەواو و کاریگەرێتییەکانی هەڵوێستە جیاجیاکانو تەسکیو کەمی کات یاخود نەبوونی کاتی تەواو و دیراسەکردنی ئەگەرەکانی ئەنجامی بڕیارەکان وەستاوە، ئەمە جگە لە جۆری یەکەو ناوەندەکانی بڕیار. هەموو ئەم فاکتەرانە پێکەوەو بە کارلێکی هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان کاریگەریان هەیە لە سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی بڕیارەکان.

گرنگی ئەم قۆناغەش لەوەدا دەردەکەوێت کە تەنها هەڵبژاردنی ئەگەرو جێگرەوەکان ناگرێتەوە، بەڵکو هەڵسەنگاندنی هەر جێگرەوەیەك لەگەڵ ئەنجامو شوێنەوارەکانی بە بەراورد لەگەڵ جێگرەوەکانی تردا دەگرێتەوە، دیارە ئەمانەش هەمووی بەدیدو بۆچوونی بڕیار بەدەست دەبێت بۆ هەڵوێستەکەو دیاری کردنی ڕەهەندەکانی...

## چوارەم:- قۆناغی بڕیار دەرکردن

دوای ئەوەی بڕیار بەدەست یەکێکی لە جێگرەوەکان هەڵبژارد کە بە بۆچوونی خۆی باشترینیانە، پێویستە لەسەری کە ئەم جێگەرەوەیە لە باری تیۆرییەوە بگوێزرێتەوە بۆ باری بەکردارگردنی، ئەمەش بەهۆی ئامرازو

داموو دەزگا جیاجیاکانی دەوڵەتەوە بە پێی گونجانیان لەگەڵ واقیعدا ئەنجام دەدرێت، وە پاش ئەوەی بڕیار بەدەست هەستا بە دیاریکردنی جێگرەوەکان و هەڵسەنگاندنیان و بەراورد کردنی کاردانەوەو ئەگەرەکانی ئەو ئەنجامانەی کە لێیان دەکەوێتەوە، پێویستە لە سەری هەستێت بەکاری دیاری کردن و بەراورد کردنێکی وورد بەلای کەمەوە لە نێوان دوو جێگرەوەدا کە یەک بەهایان هەبێت یاخود هاوشێوە بن، پاشان باشترین جێگرەوە هەڵبژێرێت کە بەتوانا ترینیان بێت بۆ جێبەجێ کردن و بەدی هێنانی ئامانجی خوازراو بە کەمترین زیان.[٢٣]

قۆناغی بڕیار دەرکردن بەئەڵقەی گرێدەری قۆناغی پێش خۆی و قۆناغی دوای خۆی دادەنرێت وەک (دکتور مازن ئیسماعیل ڕەمەزانی) دەڵێت. هەروەک چۆن پێی وایە کە پرۆسەی دروستکردنی بڕیار لە ڕووی لێکدانەوەوە لەسێ قۆناغی لاوەکی پێک دێت کە بریتین لە:-

١- قۆناغی هزری (پێش بڕیار).

٢- قۆناغی ڕێکخستن (دەرکردنی بڕیار).

٣- قۆناغی سیاسی (قۆناغی دوای بڕیار).[٢٤]

لە قۆناغی دەرکردنی بڕیاردا هەڵبژاردنی نێوان جێگرەوە پێشنیار کراوەکان لە بەرژەوەندی یەکێکیاندا یەکلا دەکرێتەوە، لە پێناو بەدی هێنانی ئامانجە خوازراوەکاندا.

دەتوانرێت مەرجە سەرەکیەکانی بڕیار وەرگرتنی کاریگەر کورت بکرێتەوە وەک ئەمەی خوارەوە:-[٢٥]

أ- جەخت کردن لەسەر دیاری کردن و تێگەیشتنی ئەو کێشەیەی کە بڕیاری لە بارەوە دەدرێت، کەواتە لە پێشەوە گرنگی دان بە ووردو درشتی پێش دەست کردن بە چارەسەری.

ب- پێشکەش کردنی ڕای دژو گفتوگۆ لەسەر کردنی بە مەبەستی دروست کردنی تێگەیشتنێکی گشتی هاوبەش، پاشان لێکۆڵینەوەی کۆمەڵێک ڕاو بۆچوون و شێوازی چارەسەری جۆراو جۆر.

ج- پێش گەڕان بەدوای چارەسەری ڕاستدا، گەڕان بەدوای جێگرەوەی جۆراو جۆردا.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم باسێکی ناوەندی بڕیار بکەین بە کورتی چونکە هەر لەوێوە بڕیار دەردەچێت، جا ئەو ناوەندە هەر جۆرو شێوازێك بێت یاخود هەڵگری هەرجۆرە بیرو بۆچوون و ئایدۆلۆجیایەك بێت. لەبەر ئەوەش کەسیستمە سیاسیەکان و جۆرو ڕێبازی حوکم کردنیان جیاوازە لە یەکتری، شتێکی ئاسایی‌یە کە ناوەندەکانی بڕیاریش جیاوازبن لە چۆنیەتی دەرکردنی بڕیارەکاندا بەپێی جیاوازی‌یان لە ڕێژەی بەشداری کردن لە بڕیارداندا.

لێرەدا مەبەست لە ناوەندی بڕیار ئەو چوارچێوەی ڕێکخستنەیە کە هزرو بۆچوونی بڕیار بەدەستەکان تێیدا کارلێك دەکەن و بڕیارە گرنگەکان تێیدا بە کۆتایی دەگەن بەو ئیعتیبارەی ناوەندی پەیکەری ئەو سیستمە سیاسیەیە کە پێکدێت لە کۆمەڵێك دامەزراوە کە هەر سیستمێکی سیاسی لێ پێك دێت[٢٦]. لەبەر ئەوە ناوەندی بڕیار لەهەر سیستمێکی سیاسیدا ڕەنگدانەوەی سروشتی ئەو سیستمە سیاسیەیە کە چوارچێوەیەکی تایبەتی بۆ دیاری دەکات و چالاکی تێدا ئەنجام دەدات وە لەگەڵ سروشت و بیروباوەڕو دیدو بۆچوونەکانی بۆ پەیکەری دامەزراوەی گشتی بگونجێت، ناوەندەکانی بڕیار لە ڕووی فۆرم و ناوەرۆکیشەوە جیاوازن لەیەکتری، هەروەها جاوازن لەڕووی سنورو پانتایی مافی گفتوگۆی ڕێ پێدراو لە بابەتە سیاسی‌یە گرنگ و هەستیارەکاندا، زۆر جار لەو سیستمانەدا کە سەرکردە ڕۆڵی یەکلایی کەرەوە دەگێڕێت لە زۆربەی کاروبارەکاندا وای لێدێت کە بیروباوەڕی سەرکردە نمایندەی ناوەندەکەو بگرە گەلەکەیشی دەبێت بە شێوەیەك کە لە پلەی ڕەهایی‌یەوە نزیك بێت، واتە نەك هەر ڕای جەماوەرو دام و دەزگاکان بە هەند وەرناگیرێت، بەڵکو ڕای ئەندامانی ناوەندی بڕیاریش زۆرجار، بە تایبەت لەو کاتانەدا کە لەگەڵ بیرو دیدو ویستەکانی سەرکردەی تاکڕەودا نەگونجێت، ئەوا ڕەت دەکرێتەوە.

بەکورتی دەکرێت یەکەکانی دروستکردنی بڕیار دابەش بکرێن بۆ[٢٨]:-

ا- یەکەی سەرکردەی سیاسی

ئەم یەکەیە بۆ دروستکردنی بڕیار کە لە سەرکردەی سیاسی و کۆمەڵێکی بچووك لە بەرپرسان پێك دێت، و سەرکردەی سیاسی خۆی بە تەنها خاوەنی بڕیاردانە، ئەمەش سەر دەکێشێ بۆ ئەوەی تایبەتمەندیە کەسایەتی‌یەکان

رۆڵێکی گرنگیان هەبێت لەسەر جۆری ئەو بڕیارانەی لەو یەکەیەوە دەردەچێت (ئەم جۆرە یەکەیەی بڕیار لە سیستەمە تۆتالیتاریو دکتاتوریەکاندا بەدی دەکرێت).

## ٢- یەکەی کۆمەڵی یەکگرتوو

لەم یەکانەی بڕیاردا لە ڕووی کرداری‌یەوە بڕیارەکان یەك کەس دەریان ناکات، بەڵکو دوای ئەوەی کارلێك لە نێوان ئەندامەکانیدا ڕوو دەدات بڕیارەکان دەردەکرێت، ئەمە لەگەڵ ئەوەی کە مەرج نیە هەموو ئەندامەکان کاریگەریان لە بڕیارەکاندا وەك یەك بێت. بۆیە سەرکردەی دیموکراسی جیاوازە لە سەرکردەی ئوتوکراسی لەوەدا کە پێی وایە کە ڕێگەو شێوازی دەرکردنی بڕیارەکان هەمان بەهای بڕیارەکانیان هەیە، چونکە ڕێگەو شێوازەکان لە ڕاستیدا بەشێکن جیانیابنەوە لە بڕیارەکان.[٢٩]

## ٣- یەکەی کۆمەڵە سەربەخۆکان

ئەم جۆرە ناوەندانەی بڕیار لە دوو یەکەی لاوەکی یان زیاتر پێك دێن کە هیچ کامیان ناتوانن بەبێ پشتگیری ئەوی تریان بڕیار دەربکەن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەر یەکێك لەم کۆمەڵانە دەتوانێت ڕێگر بێت لەبەردەم جێبەجێکردنی هەر دەست پێشخەریەکی یەکە یان کۆمەڵەکەی بەرامبەری (وەك لە سیستەمە پەرلەمانیە فرە حزبیەکانو سیستەمە سەرۆکایەتیەکاندا هەیە).

بەم شێوەیە بە ڕوونی دەرکەوت کە یەکەکانی بڕیار لە دەوڵەتێكو سیستمێکەوە بۆ یەکێکی دی دەگۆڕێت، بەڵام بڕیار بەدەست لەهەر دەوڵەتێکدا بەبێ ڕەچاوکردنمان بۆ چۆنێتی ناوەندەکانی بڕیار واتە ناوەندی بڕیار هەر جۆرێك بێت هەوڵ دەدات بڕیارێکی وا دەربکات کە واقیعەکە دەیخوازێتو ئامانجو بەرژەوەندی‌یەکانی دەوڵەتەکەی لەدیدی بڕیار بەدەست خۆیدا بە کەمترین زیان دێنێتە دی.

پرۆسەی دروست کردنی بڕیار لە واقیعدا ڕەنگدانەوەی زنجیرە هەنگاوێکە کە دەرەنجامەکەی بڕیارە، بڕیاریش بەشێك لە بەشەکانی پرۆسەیەکی سیاسی بەردەوام پێك دەهێنێت ئەویش پرۆسەی کردارە، بۆیە (فرانکل) بە هەڵەدا نەچووە کاتێك جەخت دەخاتەوە سەر ئەوەی کە بڕیار

خۆی (شێوازی کارێکی ئامادەکراوە لە هزری بڕیار بەدەستدا) واتە بڕیار گوزارشت کردنێکە لە چەند نیازێك کە هێشتا نەگۆڕدراوە بۆ واقیعێکی هەست پێکراو لە ڕێی یەکێك لە هۆکارەکانی جێبەجێکردنەوە.[٣٠]

جۆری بڕیارەکان بەپێی هەلومەرج و بارودۆخەکان دەگۆڕێت، لە کاتی کێشەو قەیرانەکاندا کە کاتێکی لەبەردەم بڕیار بەدەستدایەو کت و پڕیان پێوە دیارەو پێویستە بڕیارەکان خێراتر بن، ڕۆڵی سەرکردەش لە زۆربەی ئەم حاڵەتانەدا بە زەقی دەردەکەوێت. هەندێك جاریش وەڵام نەدانەوەو بێ دەنگی خۆی بۆ خۆی بە هەڵوێست یاخود بڕیارێکی سیاسی دەژمێردرێت لە سیاسەتی دەرەوەدا.[٣١]

## پێنجەم: قۆناغی جێبەجێ کردنی بڕیار

گەر بڕیار نەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە واتا گرنگیەکەی لەدەست دەدات، گرنگیەکەشی لەوەدا دەردەکەوێت کە بە باشی جێبەجێبکرێت. ئەگەر دەرکردنی بڕیار لە سادەترین واتایدا، مانای هەڵبژاردن بێت لە نێوان چەند جێگرەوەیەکدا کە بەوە جیادەکرێنەوە کە لە ئەنجامەکانیاندا دڵنیایی نیە، ئەوا جێبەجێ کردنی بڕیار واتە هەڵبژاردنی باشترین ئامرازی جێبەجێکردن کە کەمترین وزەی تێ بچێت.

پاش ئەوەی ئامانجەکان دیاری دەکرێن و داڕشتنی بڕیارەکە لە شێوەی کۆتاییدا تەواو دەبێت، پرۆسەی دروستکردنی سیاسەتی دەرەوە دەکەوێتە ئاست و قۆناغی جێبەجێکردنەوە، پێویستە بەرپرسان لە دام و دەزگاو دامەزراوەکانی جێبەجێکردندا هەستن بە پرۆسەی جێبەجێکردن[٣٢]، واتە گوێزانەوەی ناوەڕۆکی بڕیارەکەو بۆ واقیعی مومارەسەی کرداری ئەمە بەدیارکردنی دامەزراوەو لایەنە دیاریکراوەکان دەبێت بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارەکەو دیاری کردنی ئەو ئەرکەی دەکەوێتە ئەستۆیان لە ماوەیەکی زەمەنی دیاریکراو و بە تێچوونێکی دیاری کراو.

بڕیاریش وەك ئامانجێکی خوازراو دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی بەکردار جێبەجێ دەکرێت و دەگۆڕدرێت بۆ دەرەنجامێکی دیارو بەرچاو.

لە ڕاستیدا دەرکردنی بڕیارو جێبەجێکردنی بڕیار دووکاری تەواوکەری یەکترین. گواستنەوەی بڕیار بۆ کارکردن پێویستی بە وەڵامی چەند

پرسیارێك هەیە کە جێبەجێ کردنی بڕیاری بەشێوەیەکی دروست لەسەر ڕادەوەستێت، ئەمەش پرسیارەکانە:-

أ- پێویستە بڕیارەکە بەکێ ڕابگەیەنرێت؟

ب- کاری داواکراو چییە؟

ج- کێ پێویستە پێی هەڵبستێت؟

د- کەی پێویستە پێی هەڵبستێت؟

هـ- خەرجیەکانی کارەکە کێ دەیگرێتە ئەستۆی خۆی؟

وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانەش بەم هەنگاوانەی خوارەوە تەواو ئەبێت:

١- پێ ڕاگەیاندنی بڕیار.

٢- دیاری کردنی نەخشەی کارکردن.

٣- دابەشکردنی بەر پرسیارێتی یەکان.

٤- دانانی خشتەی زەمەنی.

٥- دیاری کردنی سەرچاوەکانی بودجە.[٣٣]

لەم میانەیەدا بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم قۆناغە ئاڵۆزو گرانەو پێویستی بە ووردەکاریەکی زۆر هەیە، یەکە نێودەوڵەتیەکان بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارەکانیان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو هۆکارو ئامرازانەی کە لە بەر دەستیاندا هەن، هەڵبژاردن و دیاری کردنی ئامرازەکانی جێبەجێکردنیش تا ڕادەیەکی زۆر پشت بە هەلومەرج و بارودۆخی تایبەت بە هەڵوێست و کێشەکان یاخود پشت بە گۆڕانکاریە نێودەوڵەتیەکان دەبەستێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم ئامرازانە دەکرێت هەموویان یان هەندێکیان لە کاتێکدا بەکار بهێنرێن، بۆیە دەتوانرێت بوترێت دروستە دەوڵەت مامەڵەیەکی دیبلوماسی بکات لە کاتێکدا ئامرازی جەنگی دەرروونی یاخود کاری سەربازی بەکاردەهێنێت.[٣٤]

هەروەها دەوڵەتان توانا جیاجیاکانیان بەکار دەهێنن لە بوارە هەمە جۆرەکاندا بە ڕەچاو کردنی گونجاندنیان لەگەڵ هەڵوێست و هەلومەرجەکاندا بۆ بەدیهێنانی ئامانج و مەبەستە خوازراوەکان لە بڕیارەکاندا.

چەندین ئامرازو هۆکار هەیە بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارە سیاسیە دەرەکیەکان وەك/ ئامرازە دبلوماسیەکان، ئامرازی ئابوری، کۆمەکی دەرەکی، هۆکاری سەربازی، دەزگا هەواڵگریەکان، ئامرازە ڕەمزیەکان،

هاوپەیمانێتی‌یەکان، ماددە سروشتی‌یەکان، هۆکاری تەکنۆلۆجی،و زەبرو زەنگی ماددی ... و هتد..

بۆ نموونە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەرپاکردنی جەنگ دژی هەر وڵاتێك هەموو هۆکارو ئامرازەکانی جێبەجێکردن هەر لە هۆکاری دیبلۆماسیو ئابوریو هەواڵگریو ڕەمزیو هاوپەیمانێتیو تەکنۆلۆجیو زەبرو زەنگی ماددی هەتا هۆکارە سەربازیەکانیش بەکار دەهێنێت گەر بڕیاری جەنگ بدات لە دژی عێراق بۆ جێبەجێکردنی مەرامو مەبەستەکانیو سەپاندنی زیاتری هەژموونی خۆی لە جیهاندا بەگشتیو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستو جیهانی ئیسلامیشدا بەتایبەتی.

بڕیار بەدەست لە هەڵبژاردنیدا بۆ ئامرازەکان دەکەوێتە ژێر کاریگەری چەندین فاکتەری بابەتی‌یەوە لەوانە:-

تایبەتمەنیە هاوچەرخەکانی ئەو سەردەمە، توانا خۆیەتییەکانی دەوڵەتەکەیو جۆری پەیوەندی‌یە سیاسی‌یەکانی دەوڵەتەکەی لە ئاستی نێودەوڵەتیدا، جیاوازی جۆری پەیوەندیەکانیش وا لە دەوڵەتان دەکات کە جۆرە ئامرازێك بەکاربهێنن کە لەگەڵ سروشتی پەیوەندیەکانیدا لەگەڵ دەوڵەتانی بەرامبەریدا بگونجێت.[٣٥]

هەروەها چەندین فاکتەری تر کاریگەریی لەسەر پرۆسەی جێبەجێکردن دەبێت بە شێوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ. وە پرۆسەی جێبەجێکردن لەسەر چەند پایەو مقەوماتێك وەستاوە، وەك/ سروشتی سیستمی سیاسی، جۆرو شێوازی پەیوەندی نێوان دەسەڵاتی یاسادانانو دەسەڵاتی جێبەجێکردن، سروشتی پەیوەندی نێوان ئەو دامەزراوانەی پەیوەندیان بە سیاسەتی دەرەوە هەیە، واتە فاکتەری بیروکراسی، ئاستی توانای دەزگای دیبلوماسیو دەزگا هەواڵگریەکانو ڕاگەیاندن، ئەمە جگە لە سروشتی سیستمی نێودەوڵەتی، واتە پرۆسەی جێبەجێکردنی بڕیار بریتی‌یە لە گوێزانەوەی بڕیارەکە لە باری تیۆری‌یەوە بۆ ئاستی کرداری کە پەیوەستە بە هەلومەرجو مامەڵەو پەیوەندی نێوان ژینگەی ناوخۆییو دەرەکی‌یەوە.[٣٦]

لە ڕۆشنایی ئەمانەی پێشوو کە باسمان کرد بە ڕوونی دەردەکەوێت، پرۆسەی جێبەجێکردنی بڕیار تەواوکەری پرۆسەی دروستکردنی بڕیارەو بەشێکە لێی جیا نابێتەوە، هەروەها کارێکی ئاسان نیەو چەندین ئامرازو

هۆكاری پێویستە كە بەكارهێنانیشیان لەلایەن كاربەدەستانەوە دەكەوێتە ژێر فشارو كاریگەری هەلومەرجە ناوخۆیی‌و دەرەكیەكانەوە دەوڵەتانیش بۆ جێبەجێكردنی بڕیارەكانیان پەنا دەبەنە بەر ئەو ئامرازانەی كە گەورەترین دەرەنجام‌و ئامانجی خوازراو بەدەست دەهێنن بە كەمترین زیان‌و كەمترین تێچوونی ووزەو تواناكان. كەواتە پرۆسەی جێبەجێكردن، ئاستی تواناكانی یەكەی نێودەوڵەتی بەسەر جێبەجێكردنی بڕیارەكانیدا دیاری دەكات.

## شەشەم: قۆناغی هەڵسەنگاندن و بەدوادا چوون

كاتێك بڕیار دەچێتە بواری جێبەجێكردنەوە، بە كارێكی دیارو بەرجەستە دادەنرێت كە كاردانەوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی بەدوادا دێت، چونكە بڕیار دەچێتە ڕیزی ڕەفتاری دەرەكی دەوڵەتەوەو دەوڵەتانی پەیوەندار بە بڕیارەكەوە هەڵوێست لەمەڕ بڕیارە دەركراوەكە نیشان دەدەن كە لە لایەن دەوڵەتی یەكەمەوە دەركراوە، ئەمەش بەكاردانەوەیەك دادەنرێت كە لە ئەنجامی بڕیارەكەوە ڕوودەدات، لێرەوە قۆناغی هەڵسەنگاندن‌و بەدوادا چوون دەست پێدەكات.

سەركەوتن یان شكست‌و نوچدانی بڕیار، جا بە تەواوی بێت یاخود ڕێژەیی، لەسەر جۆری كاردانەوەكان دەوەستێت، بە دەستەواژەیەكی تر، تا چەندێك ئاست‌و جۆری وەڵام دانەوەی دەرەكی لە بەرژەوەندی داخوازی‌و مەبەستەكانی بڕیارەكەدا دەبێت، بۆیە لە زۆربەی كاتەكاندا بڕیار بەدەستان هەڵدەستن بە هەڵسەنگاندنی كاردانەوە دەرەكیەكانی بڕیار، یان لە كاتی پرۆسەی جێبەجێكردندا یاخود دوای تەواو بوونی.

پرۆسەی هەڵسەنگاندن‌و بەدوادا چوونیش لە ژێر ڕۆشنایی بەراوردكردنی لە نێوان ئەنجامە كرداری‌یەكان‌و ئەنجامە چاوەڕوانكراوەكاندا ئەنجام دەدرێت، واتە بەراورد لە نێوان ئەو ئامانج‌و مەبەست‌و بابەتانەی كە پێویستە بەدی بهێنرێن وە لە نێوان ئەو بابەت‌و ئامانجانەی كە بڕیارەكە بە ئەنجامی بەرچاو بەكردار بەدی هێناون.(٣٧)

لەمیانەی ئەم هەڵسەنگاندنەدا بڕیار بەدەست ئاستی سەركەوتن یان شكستی بڕیارەكەی بەدی دەكات‌و سودێكی زۆری لێ دەبینێت بۆ ڕۆشن كردنەوەی ڕێگای دوورو درێژی پرۆسەی زنجیرە بڕیارەكانی داهاتوو لە

سیاسەتی دەرەوەدا، بۆ دەرکردن یان دەرنەکردنی بڕیاری هاوشێوەی بڕیارە هەڵسەنگێنراوەکان، بەپێی سەرکەوتن یان شکستی ئەو بڕیارانەی لەوەو پێش دراون.

واتە لەم پرۆسەیەدا بڕیار بەدەست دەتوانێت خاڵی هێزو خاڵی لاوازیی دیاری بکات لە بڕیارەکاندا، و سوودی لێ وەربگرێت لە بڕیارەکانی داهاتوویدا.

لە هەڵسەنگاندنی دەرەنجامی بڕیاریشدا دەردەکەوێت کە بڕیارەکە یان ڕاستەو سوود بە گەل و نیشتمان دەگەیەنێت، یان هەڵەیەو زیانی بۆ بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت دەبێت، بە شێوەیەك وا لە خاوەن بڕیار دەکات کە چاو بە بڕیارو جۆری سیاسەتەکانیدا بخشێنێتەوە، بۆ ئەوەی جارێکی تر تووشی تەنگ و چەڵەمەو زیان نەبێتەوە لە دەرکردنی بڕیارو جێبەجێکردنیدا.[٣٨]

ئەم چاو پێدا خشاندنەوەیەش یان بە ناساندن و هەڵسەنگاندنی نوێ دەبێت بۆ هەل و مەرج و بارودۆخە نوێیەکان بەشێوەیەکی ووردتر، یان بە گۆڕینی ئامرازەکانی جێبەجێکردنی بڕیارەکە دەبێت بە شێوەیەك کە لەگەڵ پێویستیەکاندا بگونجێت و ئامانجە خوازراوەکان بهێنێتە دی، ئەمەش بە بەدوادا چوونی ئەنجامەکانی بڕیارەکەو هەڵسەنگاندنی ئامرازەکان دەبێت لە پێناوی ئەوەدا کە بڕیار بەدەست شارەزاو هۆشیار بێت وە زانا بێت بە باشترین ئامراز بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی لە داهاتوودا، چونکە پرۆسەی دروستکردنی بڕیار پرۆسەیەکی بەردەوامەو بەدوای یەکدا دێت.

لە زۆربەی بڕیارەکانیشدا پێویستە بڕیار بەدەست هەوڵ بدات کۆتا چارەسەرو کۆتا ئامرازی، بۆ چارەسەرکردنی قەیران و تەنگژەکان، ئامرازی سەربازی و جەنگ بێت، واتە پێویستە لەسەری هەوڵی چارەسەری کێشەکان بە ئامرازی دیبلوماسی و ئاشتیانە چارەسەر بکات و ئامرازی سەربازی کۆتا هۆکار بێت بۆ چارەسەرکردن، چونکە هەمیشە هۆکاری سەربازی زیانێکی زۆری ماڵی یان گیانی یاخود هەردووکیانی بەدوادا دێت.

# پەراوێزەکانی بەشی سێهەم

(١) د. مازن اسماعيل الرمضاني، في عملية اتخاذ القرار السياسي الخارجي، مصدر سبق ذكره، ص١٤٩.
(٢) نفس المصدر السابق، ص١٥٠، وانظر ايضا: قادر عبدالرحمن، هەڵوەستەیەك لەسەر پرۆسەی دروست كردنی بڕیاری ڕامیاری، مجلة الثقافة الكوردستانية، المركز الثقافي الشعبي الكوردستاني، العدد (٧) كانون الثاني، ٢٠٠٢، ص٦٤.
(٣) هاني الياس خضر الحديثي، مصدر سبق ذكره، ص٦٧.
(٤) د. نازلي معوض احمد، الإدراك الياباني للنظام الدولي، مجلة السياسة الدولية العدد ١٠١، السنة السادسة والعشرون، يوليو ١٩٩٠، ص٥٨.
(٥) بيسير رينوفان وجان باتيست دوروزيل، مدخل الى تأريخ العلاقات الدولية، ترجمة: فايز كم نقش، منشورات البحر المتوسط، بيروت-باريس، الطبعة الثانية ١٩٨٢، ص٥٦٧.
(٦) عبداللطيف علي المياح، المعلومات وعملية صنع القرار السياسي الخارجي، مجلة الأمن القومي، كلية الأمن القومي، العدد ١، سنة ١٩٨٦، ص٥٢.
(٧) د. مازن اسماعيل الرمضاني، في عملية اتخاذ القرار السياسي الخارجي، مصدر سبق ذكره، ص١٥٧.
(٨) دار السلام، الحزب الاسلامي العراقي، لندن، العدد ١١١ صفر١٤١٨-- حزيران١٩٩٧، ص١٩، والعدد ١١٢ ربيع الأول -تموز ١٩٩٧، ص٢٤.
(٩) هاني الياس خضر الحديثي، مصدر سبق ذكره، ص٧٨.
(١٠) د. اسماعيل صبري مقلد، العلاقات السياسية الدولية، دراسة في الأصول والنظريات، مطبعة جامعة الكويت، الكويت، الطبعة الثالثة ١٩٨٤، ص١٣٨.
(١١) د. مازن اسماعيل الرمضاني، في عملية اتخاذ القرار السياسي الخارجي، مصدر سبق ذكره، ص١٥٩.
(١٢) د. اسماعيل صبري مقلد، اتخاذ القرارات في السياسة الخارجية، مجلة السياسة الدولية، العدد١٤، السنة الرابعة، اكتوبر ١٩٦٨، ص١٤٤.
(١٣) نفس المصدر والمكان.
(١٤) د. عوض بن محمد القرني، حتى لا تكون كلا طريقك الى التفوق والنجاح، دار الأندلس الخضراء، نجدة، الطبعة الرابعة، ١٩٩٧، ص٨٨.
(١٥) د. مازن اسماعيل الرمضاني، في التخطيط السياسي الخارجي - دراسة نظرية، مجلة الحقوقي، جمعية الحقوقيين العراقيين، العددان الأول والثاني، السنة العاشرة، ص٣٨.
(١٦) د. مازن اسماعيل الرمضاني، في عملية اتخاذ القرار السياسي الخارجي، مصدر سبق ذكره، ص١٦٢.
(١٧) عبداللطيف علي المياح، مصدر سبق ذكره، ص٥٤-٥٥.

(١٨) د. مازن اسماعيل الرمضاني، السياسة الدولية: بحث في منهاج اتخاذ القرار السياسي الخارجي، مجلة العلوم السياسية والقانونية العدد ١، حزيران١٩٧٦، دار الحرية للطباعة، بغداد ص١٦٥.
(١٩) هاني الياس خضر الحديثي، مصدر سبق ذكره، ص٨٧.
(٢٠) د. مازن اسماعيل الرمضاني، السياسة الدولية: بحث في منهاج اتخاذ القرار السياسي الخارجي مصدر سبق ذكره، ص١٦٦-١٦٧.
(٢١) نفس مصدر السابق، ص١٦٧.
(٢٢) هاني الياس خضر الحديثي، مصدر سبق ذكره، ص٨٩.
(٢٣) د. مازن اسماعيل الرمضاني، في عملية اتخاذ القرار السياسي الخارجي، مصدر سبق ذكره، ص١٦٨.
(٢٤) د. مازن اسماعيل الرمضاني، السياسة الخارجية، مصدر سبق ذكره، ص٣٦٧.
(٢٥) د. هشام الطالب، ڕێبەری مەشقی سەرکردەیی، وەرگێڕان: د. صلاح عزيز وصادق عثمان، مطبعة پەیڤ، السليمانية، ٢٠٠٠، ص٨٣.
(٢٦) هاني الياس خضر الحديثي، مصدر سبق ذكره، ص٩٩.
(٢٧) نفس المصدر والمكان.
(٢٨) د. مازن اسماعيل الرمضاني، السياسة الخارجية، مصدر سبق ذكره، ص٣٦٨-٣٧٢.
(٢٩) د. عبدالحليم عباس قشطة، الجماعات والقيادة، مؤسسة دار الكتب، جامعة الموصل، ١٩٨١، ص٨٨.
(٣٠) د. مازن اسماعيل الرمضاني، في عملية اتخاذ القرار السياسي الخارجي، مصدر سبق ذكره، ص١٧٢.
(٣١) نفس المصدر، ص١٧٣.
(٣٢) زايد عبيدالله المصباح، مصدر سبق ذكره، ص٤١.
(٣٣) د. هشام الطالب، مصدر سبق ذكره، ص٩٥-٩٧.
(٣٤) د. احمدعباس عبدالبديع، العلاقات الدولية أصولها وقضاياها المعاصرة، الشباب الحر، ١٩٨٨، ص١٤٩.
(٣٥) د. مازن اسماعيل الرمضاني، في عملية اتخاذ القرار السياسي الخارجي، مصدر سبق ذكره، ص١٧٧.
(٣٦) زايد عبيدالله المصباح، مصدر سبق ذكره؛ ص٤١-٤٢.
(٣٧) د. مازن اسماعيل الرمضاني، في عملية اتخاذ القرار السياسي الخارجي، مصدر سبق ذكره، ص١٧٤.
(٣٨) فؤاد صديق، صنع القرار السياسي، مجلة (سەنتەری برایەتی)، العدد (٢)، السنة الثانية، نهاية شباط ١٩٩٩، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ص٤٣-٤٤.

# کۆتـاییو دەرەنجام

باسکردنو دیراسەکردنی پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی کـارێکی زۆر ووردو ئـاڵۆزە، چونکـە بـاس کـردن لـە چۆنێتـی مومارەسەکردنی سیاسەت دەکات لە یەکێك لە وردترین ئاستەکانیدا کە بڕیاری سیاسی دەرەکییە.

ئێمە لەم کۆتاییەدا کۆمەڵێك دەرەنجام دەخەینە ڕوو کە بە کرۆکو ناوەڕۆکی بابەتەکە دێتە هەژمارد:

یەکەم:

پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکیو بیرۆکەی بڕیاری سیاسـی شـتێکی نـوێ نییـە، بـەڵکو بابەتێکـە ڕیشـەی لـە مێـژووی سیاسـیدا کێشـاوەو هـەر لـە سـەرەتای دروسـتبوونی دەسـەڵاتو دەوڵەتـەوە بوونـی هەیـە، هـەر چـەندە بابەتەکـە لـە زانسـتی سیاسـی هاوچەرخدا نوێیەو گرنگیەکی ناوازەی بەخۆوە بینیوە.

دووەم:

ڕەفتـاری سیاسـی دەرەکـی خـاوەن بڕیـار گوزارشـت لـە سیاسـەتی دەرەکـی وولاتەکـەی دەکـات، ئـەم ڕەفتـارەش فشـارو کاریگـەری فاکتـەر گـەلێك دەوریـان داوە، سیاسـەتی دەرەکیـش بـە دەرەنجـامی کـارلێکی هـەموو ئـەم فاکتەرانـە، نـاوخۆیی بـن یـان دەرەکـی، کاریگـەر دەبێـت. فشاری فاکتەرەکانیش ڕێژەینو زۆرجار بە شێوەیەك کارلێك دەکەن کە ناتوانرێت کاریگەری فاکتەرێك لە فاکتەرێکیتر لێك جیابکرێتەوە.

سێیەم:

بڕیـاری سیاسـی بـە ئەڵقەیـەکی بنچینـەیی دادەنرێـت لـە پرۆسـەی سیاسـیدا، وە دەرەنجـامی کـۆی ڕووداو و پێشـهاتو ئیجرائـاتو بارودۆخەکانـە، هـەروەها ڕوانگەیەکـە بـۆ بـەدی هێنـانی چـەند ئاڕاستەیەکی نوێ لە واقیعدا.

بڕیـــار نـــاوەندی پرۆســـەی سیاســـیو دەرەنجامەکانیـــەتی، وە ڕێچکەیەکی سیاسیە کە ئامـانجو هۆکـارو کاردانـەوەکان لەمیانەیـەوە دیـاری دەکرێـت، کـە بـەکۆی هـەموویان کرۆکـی پرۆسـەی کـارلێکی سیستمی سیاسـی لەگەڵ ڕووداو و هەلومەرجە سیاسیەکاندا دروسـت دەکەن.

چوارەم:

پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی کارێکی سـادەو سانا نیە کە تاکە کەسێکی دیاری کراو هەستێت بە ئەنجام دانـی، هـەر چـەندە هوشـیارو بـەتواناش بێـت، بـەڵکو بڕیـاری سیاسـی دەرەکـی چەندین بنەماو پێوەرو فاکتەری جۆراو جۆر بەشداری تێدا دەکـەن. بۆ نموونـە: بەشـداری دامو دەزگا سیاسیەکان، گروپـەکانی فشـار، یاسـاو ڕێسـا دەسـتوریەکان، بنچینـەو عـورفو یاسـاو فاکتـەرە مەعنەویـە نێودەوڵەتیەکان، تێگەیشتنی زانستیانەو واقیعیانە بۆ کێشـەو ڕووداوە سیاسـیە هەنوکەییـیەکان، ڕاوێژ کـردن، بەشـداری کـردن لـە بەئـەنجام گەیاندندا، پەیوەندی کردن، ڕەهەندە ڕەمزیو میدیاکان، باری دەرونـی بڕیار بەدەستانو جۆری کەسایەتیانو ... هتد.

پێنجەم:

ڕۆڵـی بڕیـار بەدەسـت لـە پرۆسـەی بڕیـارداندا وەك فاکتـەرێکی سـەرەکی دەردەکـەوێت، چونکە بڕیـار بەدەسـت فاکتـەرە بابەتیـیەکان بەدیدو بۆچوونـی خۆی هەڵدەسەنگێنێت نەك بەو شێوەیەی لـە واقیعـدا بونیان هەیـە، لـە کـاتێکدا ئـەم هەڵسـەنگاندنانەش چـەندین فاکتـەری دەرونـیو جـۆری کەسـایەتی خـاوەن بڕیـارو جـۆرو ڕێـژەی زانیـاری بەردەستو ...هتد دەوریان داوەو کاریگەریان هەیە لەسەری.

شەشەم:

لە جیـهانی هاوچـەرخدا ڕۆڵـی بەرژەوەندیـیـە ئابوریـیـەکانو کۆمپانیـا فـرە ڕەگـەزەکانو ڕێکخـراوە نێودەوڵـەتیو ناوچەییـیـەکانو گەشـەکردنی ڕۆڵـی ڕێکخـراوە ناحکومیـەکانو ڕۆڵـی یاسـای

نێودەوڵەتی و ڕای گشتی جیهانی بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا زیادی کردووەو بووەتە دیاریکەرو سنوورداریەك بۆ ڕەفتاری دەوڵەتان، هەروەها کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندی کردن ڕۆڵێکی گەورەو بەرچاو دەبینن لە ڕێنوێنی کردنی و کاریگەرێتی لەسەر بڕیارو بڕیار بەدەستان.

**حەوتەم:**

کاری سیاسی کارێکی بەردەوامەو پرۆسەی دروستکردنی بڕیاریش بەهەمان شێوە پرۆسەیەکی بەردەوامەو دەبێت بەدوای یەکدا بێت و ڕووبەڕووی ئەو هەڵوێست و پێشهات و ئەگەرەکان ببێتەوە، کە ڕووبەڕووی سیستمی سیاسی دەبنەوە، دەوڵەت دەبێت سیاسەتی دەرەکی خۆی لە ژێر ڕۆشنایی توانا خۆیەتییەکانیداو لە سایەی هەلومەرجێکی نێودەوڵەتی گونجاودا دابڕێژێت.

**هەشتەم:**

دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی کارێکی سادەو پرۆسەیەکی سانا نیە وەك یەکەمجار دەردەکەوێت، لەم پرۆسەیەدا چەندین کەناڵ و دام و دەزگا بە شێوەی ڕەسمی و نارەسمی و بەڕێژەی جیاواز بەشداری دەکەن، ئەمەش بەپێی سروشتی سیستمی سیاسی دەگۆڕێت، هەروەك چۆن ئەم پرۆسەیە بە چەندین قۆناغی‌یەك بەدوای یەکدا تێدەپەڕێت، کە هەریەکەیان تەواوکەری ئەوی تریانەو لێك جیا ناکرێنەوە، هەر بۆیە لێکدانەوەی پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی بە هەنگاوێکی زانستی دادەنرێت کە پێویستە توێژەرەوانی زانستی سیاسی ئەم هەنگاوە گرنگە بڕن لە پێناوی ناسین و زانینی وردترین و گشتگیرترین و کۆنترین - نوێترین دیاردەی کاری سیاسی کە بە هونەری ڕێکخستنی کاری سیاسی لە قەڵەم دەدرێت.

# سەرچاوەکان

## أولا/ القرآن الكريم

## ثانياً/ الكتب:

٢. ابن قيم الجوزية، زاد المعاد، الجزء الثالث، مؤسسة الرسالة، بيروت، الطبعة الثالثة، ١٩٩٨.

٣. ادولف هتلر، كفاحي، ترجمة: يونس الحاج، مطبعة الراية، بغداد، دار صادر، بيروت ١٩٩٠.

٤. اوستن رني، سياسة الحكم، ج١، ترجمة حسن علي الذنون، المكتبة الأهلية، بغداد ١٩٦٤.

٥. د. احمد عباس عبدالبديع، العلاقات الدولية أصولها وقضاياها المعاصرة، الشباب الحر، ١٩٨٨.

٥. د. احسان محمد الحسن، علم الاجتماع السياسي، جامعة بغداد، مطابع جامعة الموصل ١٩٨٤.

٦. أمين هويدي، كيسنجر وإدارة الصراع الدولي، دار الموقف العربي، مصر، الطبعة الثانية، ١٩٨٦.

٧. د. إسماعيل صبري مقلد، نظريات السياسة الدولية دراسة تحليلية مقارنة، منشورات دراسات السلاسل، الكويت، الطبعة الثانية، ١٩٨٧.

٨. د. إسماعيل صبري مقلد، نظريات السياسة الدولية، مطبعة الكويت، الكويت، الطبعة الثالثة، ١٩٨٤.

٩. بيسير رينوفان وجان باتيست دوروزيل، مدخل الى تأريخ العلاقات الدولية، ترجمة: فايز كم نقش، منشورات البحر المتوسط، بيروت – باريس، الطبعة الثانية ١٩٨٢.

١٠. جان مينو، الجماعات الضاغطة، ترجمة يهيج شعبان، منشورات عويدان، بيروت، الطبعة الثانية، ١٩٨٠.

١١. جورج سباين، تطور الفكر السياسي، الكتاب الثالث، ترجمة: د. راشد البراوي، تقديم: أحمد سويلم العمري، بدون اسم المطبعة.

١٢. جيمس منزيس بلاك، كيف تكون مديرا ناجحا، ترجمة: عبدالحليم ثابت، دار قباء، القاهرة، الطبعة الثانية، ١٩٩٩.

١٣. د. جلال عبدالله معوض، صناعة القرار التركيو العلاقات العربية – التركية، مركز دراسات العربية – بيروت، الطبعة الأولى، ١٩٨٨.

١٤. هادي العلوي، قاموس الدولة والاقتصاد، دار الكنوز الأدبية، بيروت، الطبعة الأولى ١٩٩٧.

١٤. هادي العلوي، قاموس الدولة والاقتصاد، دار الكنوز الأدبية، بيروت، الطبعة الأولى ١٩٩٧.
١٥. د. هالة ابوبكر سعودي، السياسة الأميركية تجاه الصراع العربي – الإسرائيلي ١٩٦٧ –١٩٧٣، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، الطبعة الأولى ١٩٨٣.
١٦. هاني اياس خر الحديثي، في عملية صنع القرار السياسي الخارجي، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨٢.
١٧. د. هشام الطالب، رێبەری مەشقی سەرکردەیی، وەرگێران: د. صلاح عزيز وصادق عثمان، مطبعة بەيف، سلێمانی، ٢٠٠٠.
١٨. د. وليد حمدي الاعظمي، العلاقات السعودية – الأميركية وأمن الخليج في وثائق غير منشورة (١٩٦٥ – ١٩٩١) دار الحكمة، الطبعة الأولى، ١٩٩٢.
١٩. زايد عبيدالله مصباح، السياسة الخارجية، منشورات ELGA، مالطا، ١٩٩٤.
٢٠. حميد الساعدي، مبادئ القانون الدستوري وتطور النظام السياسي في العراق، دار الحكمة، موصل، ١٩٩٠.
٢١. د. حميدة سميسم، نظرية الرأي العام مدخل، وزارة الثقافة والإعلام، بغداد، ١٩٩٢.
٢٢. د. حسن حنفي ود. صادق جلال العظم، ما العولمة، دار الفكر، دمشق، الطبعة الثانية ٢٠٠٠.
٢٣. د. حسن صعب، علم السياسة دار العلم للملايين، بيروت، الطبعة الخامسة ١٩٧٧.
٢٤. د. كمال المنوفي، أصول النظم السياسية المقارنة، شركة الربيعان، الكويت، الطبعة الأولى، ١٩٨٧.
٢٥. د. كمال مظهر أحمد، ميكافيللي والميكافيلية، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٤.
٢٦. د. لويد جنسن، تفسير السياسة الخارجية، ترجمة: محمد ابن احمد مفتي و د. محمد السيد السليم، مطالع جامعة الملك سعود، الرياض، الطبعة الأولى، ١٩٨٩.
٢٧. د. سازن اسماعيل الرمضاني، السياسة الخارجية، دراسة نظرية، جامعة بغداد، ١٩٩١.
٢٨. مارسيل ميريل، سوسيولوجيا العلاقات الدولية، ترجمة: د. حسن نافعة، دار المستقبل العربي، بيروت، القاهرة، الطبعة الأولى، ١٩٨٦.
٢٩. موسوعة السياسة، الجزء الرابع، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت.
٣٠. الموسوعة العربية العالمية، ج١٦، مؤسسة أعمال الموسوعة، رياض، الطبعة الثانية، ١٩٩٩.
٣١. محمد الحسيني الشيرازي، فقه السياسة، دار الأيمان، مطبعة رضائي، سقم، ١٩٨٣.

٣٢. د. محمد نصر مهنا، علم السياسة، جامعة أسيوط، القاهرة، بدون تاريخ.
٣٣. د. محمد السيد سليم، تحليل السياسة الخارجية، دار الجيل، بيروت، القاهرة، تونس، الطبعة الثانية ٢٠٠١.
٣٤. د. محمد عمارة، معركة المصطلحات بين الغرب والإسلام، دار نهضة مصر، ١٩٩٧.
٣٥. د. محمد فاروق النبهان، نظام الحكم في الإسلام، جامعة الكويت، الكويت، ١٩٨٧.
٣٦. ممدوح الزوبي، هل ستسقط أميركا كما سقط الاتحاد السوفيتي رؤية مستقبلية، مؤسسة الأيمان، بيروت، دار الرشيد، دمشق، الطبعة الثانية، ١٩٩٧.
٣٧. المنجد في اللغة والإعلام، دار الشرق، بيروت، الطبعة الثامنة والعشرون، ١٩٨٦.
٣٨. منصف السليمي، صناعة القرار السياسي الأمريكي، مطبعة مركز الدراسات العربي – الأوروبي، الرباط، طبعة أولى، ١٩٩٧.
٣٩. نيقولو ميكافيلي، الأمير، فاروق سعد، تراث الفكر السياسي قبل الأمير وبعده، تعريب: خيري حماد، دار الآفاق الجديدة، بيروت، الطبعة الثامنة، ١٩٧٧.
٤٠. د. السيد العليوة، صنع القرار السياسي في منظمات الإدارة العامة، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٨٧.
٤١. عبدالجبار عبد مصطفى، الفكر السياسي الوسيط والحديث، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، الجمهورية العراقية، الطبعة الأولى، ١٩٨٢.
٤٢. عبدالله العروي، مفهوم الدولة، المركز الثقافي، العربي، دار البيضاء، بيروت، الطبعة الخامسة، ١٩٩٣.
٤٣. د. عبدالحليم عباس قشطة، الجماعات والقيادة، مؤسسة دار الكتب، جامعة، الموصل، ١٩٨١.
٤٤. عبدالحميد محمود الخطاب، دور المؤسسة العسكرية في القرار السياسي الإسرائيلي، دار الشؤون الثقافية العامة بغداد، الطبعة الأولى ١٩٨٩.
٤٥. عبدالمعطي محمد عساف، مقدمة الى علم السياسة، دار مجد لاوى، عمان، الطبعة الثانية، ١٩٨٧.
٤٦. د. عبدالقادر محمد فهمي، النظام السياسي الدولي، دراسة في الأصول النظرية والخصائص المعاصرة، دار وائل للنشر، عمان الطبعة الأولى ١٩٩٧.
٤٧. عبدالقادر عبدالعزيز، العمدة في إعداد العدة، بدون سنة ومكان الطبع.
٤٨. د. عبدالرزاق عباس حسين، الجغرافية السياسية مع التركيز على المفاهيم الجيوبولوتيكية، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٧٦.
٤٩. د. عوض بن محمد القرني، حتى لا تكون كلا طريقك الى التفوق والنجاح، دار الأندلس الخضراء، جدة، الطبعة الرابعة ١٩٩٧.

٥٠. د. علي عودة العقابي، العلاقات السياسية الدولية دراسة في الأصول والتار
والنظريات، دار الجماهيرية، بنغازي، الطبعة الأولى، ١٩٩٦.
٥١. د. فاضل زكي محمد، السياسة الخارجية وابعادها في السياسة الدولية، مطب
شفيق، بغداد، الطبعة الأولى ١٩٧٥.
٥٢. القاموس الحديث للتحليل السياسي، انكليزي – عربي، ترجمة: سم
عبدالرحيم الجلبي، الدار العربية للموسوعات، بيروت، الطبعة الأولى، ١٩٩٩.
٥٣. د. صادق الأسود، علم الاجتماع السياسي أسسه، وأبعاده، وزارة التعليم العا
والبحث العلمي، جامعة بغداد.
٥٤. د. صباح محمد محمود، وآخرون، الجغرافية السياسية، وزارة التعليم العا
والبحث العلمي، الجمهورية العراقية، بدون سنة ومكان الطبع.
٥٥. د. روبرت و د. كانتور، السياسة الدولية المعاصرة، ترجمة د. احمد ظاهر
مركز الكتب الأردني، ١٩٨٩.
٥٦. شريف جويد العلوان، السياسة الخارجية الأميركية وازمة الشرق الأوسد
١٩٦٧ –١٩٧٣، مطبعة المعارف، بغداد، الطبعة الأولى، ١٩٧٨.
٥٧. د. ضرغام عبدالله الدباغ، قضايا الأمن القومي والقرار السياسي، مطبعة
الانتصار، بغداد، الطبعة الأولى، ١٩٨٦.
٥٨. د. غانم محمد صالح، الفكر السياسي القديم، جامعة بغداد، دار الحرية، بغداد،
١٩٨٠.

## ثالثاً/ الرسالات والبحوث:–

٥٩. اقبال حسون القزويني، المنظمات غير الحكومية ودورها في بناء المجتمع
المدني، معهد العراق للإصلاحات الثقافة الديمقراطية، سيمنار ((التعاون الإقليمي
والدمقراطية)) أربيل، مايس، آيار، ٢٠٠١.
٦٠. ولاء عبدالباقي الرويشيدي، السياسة الخارجية الهندية، رسالة ماجستير/
المعهد العالي للدراسات القومية والاشتراكية، جامعة المستنصرية ١٩٨٣.
٦١. حسن حسين كاظم العامري، التجزئة العربية واثرها على القرار السياسي
العربي، جامعة المستنصرية، معهد الدراسات القومية والاشتراكية، قسم اعداد
مدرسى الثقافة القومية، رسالة ماجستير، ١٩٨٩.
٦٢. كانبي محمد عولا، الديمقراطية والسياسة الخاريجية، بحث بكالوريوس، جامعة
صلاحدين / كلية القانون والسياسة – قسم السياسة، اربيل، ١٩٩٧.
٦٣. نجاة طه العبيدي، السياسة الخارجية الأمريكية في الخليج العربي ٧٣ –١٩٨٠،
الجامعة المستنصرية، المعهد القومي للدراسات القومية والاشتراكية، قسم الدراسات
الدولية، رسالة ماجستير، ١٩٨٢.

٦٤. سعد خضر خلف العبيدي، دراسة تجريبية لبعض متغيرات اتخاذ القرار، جامعة بغداد، كلية آداب، علم النفس، رسالة ماجستير، سنة، ١٩٨٧.
٦٥. عارف محمد خلف البياتي، السياسة الخارجية السورية حيال الوطن العربي للفترة من عام ١٩٧٠ -١٩٨٨، رسالة ماجستير، جامعة مستنصرية، ١٩٨٨، قسم الدراسات الدولية - معهد الدراسات القومية والاشتراكية.
٦٦. عماد خلف جري يوسف، سياسة العراق الخارجية تجاه أمن الخليج العربي ١٩٦٨ - ١٩٨٨، جامعة المستنصرية، بغداد، رسالة ماجستير ١٩٩٠.
٦٧. صلاح احمد محمد أمين، الديمقراطية والجماعات الضاغطة. بحث البكالوريوس بجامعة صلاح الدين، كلية القانون والسياسة - قسم السياسة، اربيل ١٩٩٧.

### رابعا/ المجلات:-

٦٨. مجلة العلوم القانونية والسياسية، كلية القانون والسياسة، بغداد، المجلد الثاني، العدد ٢، ١٩٧٩.
٦٩. مجلة العلوم السياسية، كلية العلوم السياسية بجامعة بغداد، العدد ١، ١٩٧٩، وكذلك العدد ٢، تموز السنة الأولى ١٩٨٨.
٧٠. مجلة السياسة الدولية، مؤسسة الأهرام، القاهرة، العدد ٥٧، يوليو ١٩٧٩، والعدد ١٠١ السنة السادسة والعشرون، يوليو ١٩٩٠، والعدد ١٤، السنة الرابعة، اكتوبر ١٩٦٨.
٧١. گۆڤاری: سیاسەتی دەولی، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی ژمارە ٤، ساڵی دووەم - کانونی دووەمی ١٩٩٤.
٧٢. مجلة الوسط العدد ٤١٦، ٢٠٠٠/١/١٧.
٧٣. مجلة المنار، باريس، العدد ٦٤، السنة السادسة العدد ١٦٤ابريل ١٩٩٠.
٧٤. المجلة العربية للعلوم السياسية، الجمعية العربية للعلوم السياسية، بغداد: العدد الثاني، السنة الثالثة ١٩٨٨، والعدد ٧، تشرين الثاني ١٩٩٢.
٧٥. مجلة آفاق عربية، دار الشؤون الثقافية العامة، وزارة الثقافة، بغداد، العدد الأول (كانون الثاني - شباط)، ١٩٩٩.
٧٦. مجلة البحوث الإعلامية، العدد ١٩-٢٠، السنة السابعة ٢٠٠٠.
٧٧. مجلة الأمن القومي، كلية الأمن القومي، العدد ١، سنة ١٩٨٦.
٧٨. مجلة الحقوقي، جمعية الحقوقيين العراقيين، العددان الأول والثاني، السنة العاشرة، ١٩٨٧.

٧٩. مجله (سەنتەری برايەتی)، مطبعة وزارة التربية، أربيل، العدد (٢)، السنة الثانية، نهاية شباط ١٩٩٩.
٨٠. مجلة الثقافة الكوردستانية، المركز الثقافي الشعبي الكوردستاني، العدد (٧) كانون الثاني، ٢٠٠٢.
٨١. دار السلام، الحزب الاسلامي العراقي، لندن، العدد ١١١ صفر ١٤١٨ – حزيران ١٩٩٧، والعدد ١١٢ ربيع الأول – تموز ١٩٩٧.

## خامساً/ المحاضرات:–

٨٢. د. اراس دارتاش، العلاقات الدولية، محاضرات القاها على طلبة المرحلة الثانية بقسم الصحافة، المعهد الفني السليمانية ٢٠٠٢.
٨٣. د. مهدي جابر مهدي، محاضرات في الفكر السياسي الوسيط، القاها على طلبة الصف الثالث بقسم السياسة، كلية القانون والسياسة، جامعة صلاح الدين، سنة، ٢٠٠٠ – ٢٠٠١.
٨٤. د. مهدي جابر مهدي، محاضرات في نظريات النظم السياسية، ألقيت على طلبة الصف الثالث بقسم السياسة بكلية القانون والسياسة للعام الدراسي ١٩٩٨ – ١٩٩٩.
٨٥. فائزة حسين، مدخل الى علم السياسة، محاضرات ألقيت على طلبة المرحلة الأولى في قسم العلوم السياسية بكلية القانون والسياسة، جامعة صلاح الدين، اربيلن سنة ١٩٩٨ – ١٩٩٩.
٨٦. د. خالد سعيد توفيق، محاضرات في حقوق الإنسان، ألقاها على طلبة الصف الثاني، بقسم العلوم السياسية، كلية القانون والسياسة، جامعة صلاح الدين، سنة ٢٠٠٠ – ٢٠٠١.
٨٧. فائزة حسين، محاضرات في التأريخ السياسي القديم، ألقيت على طلبة المرحلة الأولى بقسم السياسة في كلية القانون والسياسة، جامعة صلاح الدين، سنة ١٩٩٨ – ١٩٩٩.
٨٨. د. مهدي جابر مهدي، محاضرات في التطورات السياسية في الشرق الأوسط، ألقاها على طلبة الصف الرابع بقسم السياسة، كلية القانون والسياسة، جامعة صلاح الدين، اربيل، سنة، ٢٠٠٢.